# ماسۆنیەت

کورتە باسێکی مێژوویی

حەسەن بارام










ناوەندی هزر
بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە
هەولێر - پشت پارێزگا
نزیك مزگەوتی مەحموود عەلاف




٠٧٥٠٤٤٤٧٤٦٧ - ٠٧٥١١٣٠٢٩٥٩
nawendi.hzr@gmail.com
nawandy.hzr.1
nawendi.hzr
nhzr.net

ناوی کتێب: ماسۆنییەت(کورتە باسێکی مێژوویی)



نووسەر: حەسەن بارام

بابەت: مێژوویی

هەڵەبڕ: بورهان حاتەم

دیزاینی بەرگ و ناوەڕۆك: ناوەندی هزر

چاپی سێیەم: ٢٠١٥

تیراژ: ٢٠٠٠ دانە

نرخ: ٤٠٠٠



ناوەندی هزر بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە بەرپرس نییە لە بۆ چوونی نووسەر و وەرگێڕ،
بەڵکو ناوەڕۆکی کتێب گوزارشتە لە بۆچوونی خۆیان.

لەبەڕێوبەرایەتی گشتی کتێبخانەکان
ژمارەی سپاردنی(١١٤٣) ساڵی (٢٠١٠)ی دراوەتێ.

داب و نەریتەکانی ماسۆنییەت زۆر کۆنە، ماسۆنییەت هەر هەبووە پێش ئەوەی هەسارەی زەوی دروست بێ، چونکە لەچینەکانی ئاسماندا بڵاوبووبوەوە..

د.ئۆلیفەر

ماسۆنییەت دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی کۆن و ئەم بابەتە لە "ئادەم"ەوە دەست پێدەکات..

د.ئەندرسۆن

## ناوەڕۆك


| | |
|---|---|
| پێشەكی | ٩-١٤ |
| بزوتنەوە نهێنییەكان لە مێژوودا | ١٥ |
| هێزی شاراوە(القوة الخفية) | ١٧ |
| ئەلغەنوسییە(الغنوسية العرفانية) | ٢٥ |
| حەشاشەكان(الحشاشون) | ٢٩ |
| نورانییەكان(النورانيون) | ٣٥ |
| بزوتنەوەی بابی (البابية والبهائية) | ٤١ |
| سوارەكانی هەیكەل | ٤٩ |
| كۆمەڵە نهێنییەكانی تر | ٥٧ |
| ڕەگ و ڕیشەی ماسۆنیزم | ٥٩ |
| ماسۆنییەت وەك زاراوە | ٦١ |
| پێناسەی ماسۆنییەت | ٦٣ |
| مێژووی كۆنی ماسۆنییەت | ٦٧ |
| سەرهەڵدانەوەی ماسۆنییەت بە شێوە هاوچەرخەكەی | ٧٧ |
| جۆرەكانی ماسۆنییەت | ٨١ |
| ئامانجەكانی ماسۆنیزم | ٨٣ |
| پەیوەندی نێوان ماسۆنییەت وجولەكە | ٩٣ |
| ئیشكالیەتی نێوان ماسۆنیزم و ئایین | ٩٧ |
| ئایە ماسۆنییەت ڕێكخراوێكی ڕامیارییە؟ | ١٠٥ |

مەحفەلەکانی ماسۆنییەت ١١١
ژمارەی ئەندامانی ئەم کۆمەڵەیە لە جیهاندا ١١٧
یانەکانی ڕۆتاری (نوادی الروتاری) ١٢٣
ماسۆنییەت لە جیهاندا ١٢٧
ئینگلتەرا ١٢٧
ئەمریکا ١٢٨
کۆماری میسر ١٣١
سوریا ١٣٨
عێراق ١٤١
کوردستان ١٤٨
ناودارانی ماسۆنییەت لە جیهاندا ١٥١
ئەندامە دیارەکانی ماسۆنییەت لە ڕۆژئاوا ١٥٣
ئەندامە دیارەکانی ماسۆنییەت لە جیهانی عەرەبی و
ئیسلامیدا ١٥٧
قەڵاچۆکردنی ماسۆنییەت ١٦٣
سەرچاوەکان ١٧٦
پاشکۆ ١٧٨

# پێشه کی چاپی سێهەم

دوای ئەوەی وەك یەکەم لێکۆڵینەوە بە زمانی شیرینی کوردی لە سەر ڕێکخراوی ماسۆنییەتی جیهانی لە ساڵی (٢٠١٠) لە لایەن بەندەوە خرایە بەر دەستی خۆێنەری کوردی، لە ماوەیەکی زۆر کەمدا لە کتێبخانەکاندا نەمایەوە، ئەمەشیان بۆ من مایەی شادومانی بوو، لە لایەك وەك یەکەم کتێب لە سەر ئەم بابەتە ولە لایەکی تریشەوە لە ماوەیەکی هێجگار کەمدا لە بازاڕدا نەمایەوە، سەرئەنجام لە سەر داوای هەندێك لە خاوەن کتێبخانەکان بڕیارم دا چاپی دووەمی بێ هیچ دەستکارییی و زیادکردنێك چاپ بکەمەوە، ئەگەر چی پێویستی دەکرد لێکۆڵینەوەکە زیاتر دەوڵەمەند بکەم و زانیاری زیاتری بخەمە سەر، بەلاَم لە بەر چەندین فاکتەری خودی و بابەتی نەکرا، کاتێکیش بۆ جاری دووەم کەوتەوە بازاڕ لە ماوەی چەند مانگێکی کەمدا کتێبەکە لە کتێبخانەکان نەمایەوە، بێگومان ئەمە زیاتر شادومانی کردم، لە ناخی خۆمدا بڕیارم دا ئەمجارەیان چاپی نەکەمەوە تاکو بابەت و زانیاری تری دەخەمەوە سەر ولیکۆڵینەوەکە فراونتر دەبێت، وەلێ بە داخەوە لە بەر بابەتی جۆراو جۆر و بەتایبەتی بوونی چەندین پرۆژەی نوسینی تر لەبەر دەستمدا نەکرا ئەمجارەشیان ئەو خواستە بهێنمە دیی، ئەمێستاش سێ بارە کەڵکەی چاپ بەدەورما ئەخولێتەوە و دۆستانێکی زۆر داوا و پێشنیاری سێ بارە چاپ کردنەوەیان لێکردووم، لە ڕاستیدا

ئەمجارەشیان ئەم پێشنیارە هانیدام بێ هیچ زیادکردنێك چاپی سێهەمی بخەینەوە بازاڕ و تەنها ئەم پێشەکییە کورتەی بۆ زیاد بکەم.

ئومێدەوارم لێکۆڵینەوەی (ماسۆنییەت کورتە باسێکی مێژوویی) بەم چاپەی زیاتر بکەوێتە بەر دەستی خوێنەران و تا ئەندازەیەك سوود بەخش بێت، چونکە کتێبخانەی کوردی پێویستی زۆری بەم جۆرە بابەتانە هەیە، دەخوازم لەم بوارانەدا بەندە خزمەتکاری کتێبخانەی کوردی بێ.

نوسەر

٢٠١٥/٤/٨

# پێشەکی چاپی دووەم

کاتێك ساڵی (٢٠١٠) چاپی یەکەمی کتێبی (ماسۆنییەت کورتە باسێکی مێژوویی)م بە زمانی شیرینی کوردی خستە نێو کتێبخانەی کوردییەوە، لەلایەك زۆر دڵخۆشبوم بەم هەوڵە هاکەزاییەم خزمەتێکم بە کتێبخانەی کوردی کردبێت، بەڵام لە لایەکی ترەوە هەندێك دووچاری دڵەڕاوکێ و دوودڵی بومەوە، ئەمەش لەبەر ئەوەی ئەم بابەتە بە نیسبەت کتێبخانەی کوردییەوە بابەتێکی تازەیە و دەتوانم بڵێم یەکەم بەرهەمە لەم بوارەدا بە زمانی کوردی، بۆیە ترسی ئەوەم لێی نیشت کارەکەم سەرکەوتوو نەبێت و بکەومە هەڵە و کەم کوڕی زۆرەوە و کتێبەکەم بکەوێتە بەر ڕەخنە و هەڵسەنگاندنێکی توندی خوێنەرانی ئازیزەوە.

چونکە لە ڕاستیدا نوسین و قسەکردن لەسەر وەها بابەتێك کارێکی هێندە ئاسان نییە، بەڵام خۆشبەختانە دوای چەند مانگێك ئەم کتێبە لە بازاڕدا نەماو و زۆرێك لە کتێبخانەکان داوای دووبارە چاپکردنەوەیان لێ کردم، وەلێ لە بەر چەند هۆکارێك بەباشم زانی چاپی دووەمی هەندێك دوا بخەم، کاتێکیش داواکاری لە سەر کتێبەکە زیاتر بوو، لە سەر داوا و پێشنیاری چەند هاوڕێ وکتێبخانەیەك بڕیارمدا بەم پێشەکییە کورتە و بەدیزاینێکی ترەوە چاپی دووەمی ئەم کتێبە بخەمەوە نێو کتێبخانەی کوردییەوە، بەو ئومێدەی خزمەتێکم بە خوێنەر و کتێبخانەی کوردی کردبێت.

# پێشەکی چاپی یەکەم

گومانی تێدا نییە کتێبخانەی کوردی لە چەندین بواردا تا هەنووکە هەژارە، زۆر بابەت و چەمك و ڕووداوی سیاسی و فیکری و کۆمەلآیەتی هەبووە و هەیە لە جیهاندا، جێی داخە خوێنەری کوردی لە ئاستە جیاجیاکاندا، کەمترین ئاگایی و شارەزایی لێی هەیە.

لە پشت ئەم ڕەوشەش چەندین فاکتەر بونیان هەیە، وەك نەبوونی کتێب و لێکۆڵینەوە بە زمانی کوردی لە سەر ئەو بابەتانە، یان شەرم و گومان و ترسی ڕووناکبیر و خاوەن قەڵەمەکانی کورد لە هەمبەر دەرخستنی ڕاستییەکان لە سەر وەها بابەتگەلێك، ئەمەشیان ئەگەرچی ڕێژەکەی هێجگار بەرزە، بەلآم بەڕەهاییش نییە. ڕەنگە ئەمڕۆ زۆر تەوەر و بابەتی گرنگ هەن خوێنەری کورد کەمترین زانیاری و ڕۆشنبیری لە سەر هەبێت، ئەمەش بە تێڕوانینی بەندە گرفت و کورت هێنانە لە نێو فەزای ڕۆشنبیری ئێمەدا.

یەکێك لەو بابەتە گرنگانە تا ئەمڕۆ بۆ خۆم کتێب یان لیکۆڵینەوەی جددی و فراوانم بە زمانی کوردی لە سەر نەبینیوە، بابەتی ماسۆنییەتە، ڕاستە داینگە و ژینگەی سەرهەڵدانی ئەم بزوتنەوەیە ولآتی ئێمە نییە، هەروەها بە دوریشی دەزانم چ بەئاشکرا و چ بەنهێنی هیچ ڕۆڵێکی ئەوتۆی لە کوردستان گێڕابێت یان بوبێت، هەموو ئەوەش بەو مانایە نییە ئێمە مشوری وەها بابەتێك نەخۆین و زانیاری و ڕۆشنبیریمان لە سەری نەبێت، ئەم

بزوتنەوەیە وەك ڕێکخراوێکی نهێنی و کاریگەر و خاوەن باکگراوندێکی فرەڕەهەند لە دونیادا زۆرترین قسەی لەسەر دەکرێت، هەندێك بەستایش و گرنگییەوە لێیدەڕوانن، هەندێکیش لێبڕاوانە خستویانەتە بەر شەپۆلێکی توندی ڕەخنە و تاوان و بەدەیان کارەسات و ڕووداوی سیاسی و فیکری تۆمەتبار کراوە وبەدەستکرد و پیلانی جولەکە دێتە ئەژماردن، دیارە ئەم وێنە تەڵخەش زیاتر لای عەرەب بەدیی دەکرێت بەرانبەر بەم جولآنەوە پڕ لەلوغز و نهێنییە، تاکو ئێستا لە دونیادا بەسەدان و بگرە زیاتریش کتێب و لێکۆڵینەوە لەسەر لایەنە جیاجیاکانی ئەم بزوتنەوەیە نوسراوە بە هەردوو دیوی ئەریێ و نەریێ دا، بەشێکی زیاتر ئەو کتێبانەی لە بەردەستدان، بەرهەمی نوسەر و ڕووناکبیرانی عەرەبن و بەزۆریش بەئاقاری پیشاندانی وێنەیەکی تەڵخ و ناشیرینی ماسۆنییەت دا کاریان کردووە، بۆیە لێرەدا دەمەوێت سەرنجی خوێنەر بۆ ئەو ڕاستییە ڕابکێشم. بەندەش بۆ نوسینی ئەم بابەتە پتر گەڕاومەتەوە بۆ سەرچاوە عەرەبییەکان، وەلێ چەند پێم کرابێت خۆمم لە سۆزو عاتیفە بەدور گرتووە و وامکردووە بێ لایەنانە کار لە سەر ئەم بابەتە هەستیارە بکەم، هەروەها دەخوازم دیقەتی خوێنەر بۆ ئەو ڕاستییە ڕابکێشم و بڵێم پتر مەبەستم لە نوسینی ئەم بابەتە یان لێکۆڵینەوەیە ئاشناکردنی خوێنەری کوردە بە مێژوو و پێناسە و جۆر وئامانجی ئەم کۆمەڵەیە، دەبێت بزانرێت نەهاتووم وەك ڕەخنەگرێك یان وەك ستایش و پیاهەڵکارێك قسە لەسەر وەها

بابەتێك بكەم، هەر هیچ نەبێت لەم قۆناغەدا ئەمەیان كاری بەندە نییە، بۆیە سەرەتا دەكارم تەنها كۆمەڵێك زانیاری جۆراو جۆر لەسەر ئەم ڕێكخراوە نیمچە نهێنییە بخەمە بەر دەستی خوێنەری كورد.

له كۆتاییدا ئومێد دەكەم ئەمە هەنگاوێكی سەرەتایی بێت بۆ كردنەوەی دەروازەیەك، یان قسەكردنێكی جدی و بەرفراوان بێ لەسەر ئەم بابەتە، هەنوكە لانی كەم بۆ دەوڵەمەندكردنی هەگبەی ڕۆشنبیری كوردی فرە پێویستە، ئەوەی ماوە ئاماژەی بۆ بكەم ئەوەیە وەها بابەتێك بێ خەوش و كەم وكوڕی نابێت، هیوادارم لە ئایندەدا كار و بەرهەمی باشتر لەم بوارانەدا ببینین و بەهەوڵ و كۆششی هەمووان بۆشاییەكانی نێو كتێبخانەی كوردی پڕ بكرێنەوە.

# بزوتنەوە نهێنییەکان لە مێژوودا

ڕەنگە پرسیاری هەرە لۆژیکی ئەوەبێت، ئاخۆ پەیوەندی نێوان ئەم بابەتە و بزووتنەوە و گروپە نهێنییەکان لەمێژوودا چین؟ دیارە ڕووچوونە نێو مێژووی ئەم ڕێکخراوانەوە ئەو پرسیارە لای خوێنەر دروست دەکات.

بەرسڤی هەرە لۆژیکیش بۆ هەمان پرسیار، سروشت وپێکهاتە و خەسڵەتەکانی خودی ماسۆنییەتە، تا ئەندازەیەك هاوتەریب و نزیکە لە دۆخ و تایبەتمەندییەکانی ئەو ڕێکخراوانەوە، جگە لەوەی بۆچوونێکی تەندروستیش هەیە جەخت لە سەر ئەوە دەکاتەوە، لانی کەم ڕەگ و ڕیشەی ماسۆنییەت دەگەڕێتەوە بۆ هەناوی هەندێك لەو کۆمەڵەو ڕێکخراوانە، یان وردتر بڵێین بۆ دامەزراندنی ئەم بزوتنەوەیە سوود لە تایبەتمەندی و دروشم و خەسڵەتەکانی ئەو ڕێکخراوانە وەرگیراوە، ئەم بۆچوونەش زیاتر لەوەوە سەرچاوەی گرتووە جۆرێك لە هاوبەشی بوون لە ڕێوڕەسم و هێما و دروشم و هەڵسوکەوتەکاندا ڕەنگی داوەتەوە، کە دەبینرێت دواتر لە لایەن ماسۆنییەتەوە بە کارهاتووە و کاری لەسەرکراوە.

بۆ تێگەیشتن لە هەندێك لە تایبەتمەندی و مێژوو و خەسڵەتەکانی ئەم ڕێکخراوانە و دواتر بەراوردکردنی لە گەڵ

کۆمەڵەی ماسۆنییەتدا، باش وایە پێش چوونە سەر باسی بابەتە سەرەکییەکەمان، چەند سەرەقەڵەمێك لە سەر هەندێك لەو کۆمەڵە و هێزە شاراوە و نهێنییانەی نێو مێژوو بخەینە ڕوو، کە دواتر وێنەیەکی ڕوونترمان لە سەر خودی ماسۆنیزم پێدەدا.

# هێزی شاراوە (القوة الخفية)

دوای هاتنی مەسیح لەساڵی (٤٣)ی زایینی، وڵاتی فەڵەستین و ناوچەی قودس (ئۆرشەلیم) لە لایەن پادشا (هیرۆدۆسی دووەم) کە بە(ئەغریپا) ناسرابوو فەرمانڕەوایەتی دەکرا، پادشا ڕاوێژکارێکی جولەکەی هەبووە بەناوی (حیران ئەبیود) ئەم کابرایە زۆر دژ بەمەسیحییەت و لایەنگرانی بووە، بەتایبەتی کاتێك تا دەهات لایەنگرانی مەسیح لە ناوچەکەدا ڕووی لە زیادبون دەکرد، بۆیە پێشنیارێك دەخاتە بەر دەستی پادشا هیرۆدۆس و تێیدا داوا دەکات ڕێکخراوێکی نهێنی دروست بکات، ئامانجی دژایەتیکردنی پیاوانی ئایینی و لایەنگرانی مەسیحییەت بێت، هەر لەم پێشنیارەدا بە جددی بانگەشەی ئەوە دەکات هەموو هەوڵەکان بخرێنە گەڕ بەمەبەستی ڕێگرتن لە هەنگاوەکانی گەشەکردنی ئایینی مەسیحییەت و قڕکردنی هەڵگرانی بیروباوەڕی ئەم ئایینە.

بەمەش هیرۆدۆس بە بیرۆکەکەی (حیران) ڕازی دەبێت و لەهەمانکات داوای لێ دەکات یاداشتێکی تەواوی لە سەر بیرۆکە و پێشنیارەکەی پێشکەش بکات بە ئامانجی جێبەجێکردنی، هەروەها بە شێوەیەکی سەرەتایی و پێش ئەوەی ناوەڕۆکی یاداشتەکە ببینێت یەکسەر پادشا بەڵێن دەدات وەکو خۆی جێبەجێی بکات، بۆ

ڕۆژی دواتر (حيران) یاداشتەکەی خۆی لە سەر پێکهێنان و ئامانجەکانی ئەو هێزە شاراوەیە دەخاتە بەر دەستی پادشا، بۆیە بەباشمان زانی دەقی یاداشتەکە بەعەرەبی بخەینە بەر دەستی خوێنەر، دەڵێت:

(مولای الملك: لما رات انا خادمكم ومستشاركم المطيع لأوامركم العلية، إن لاحيلة لجمع شتات كلمتنا، وان لا امل بقوة تدفع تلك القوة التي ولا شك (خفية) الا بانشاء قوة خفية مثلها، فلذلك ارى من الصواب والواجب اذا حسن في عين جلالتكم وارتايتم راي عبدكم بانشاء جمعية ذات قوة اعظم منها تضم القوة اليهودية المهددة من تلك القوة الخفية، ولا يكون عالما بمنشئها ووجودها ومبادئها واعمالها الا من كان داخلا فيها، ولن ندع احدا يعرف اننا اسسناها الان الا المؤسسين الذين تختارهم جلالتكم. واما قراراتها السرية الهامة فلن يعرفها الا من يكون عضوا كاملا فيها، وسيكون مركز الجمعية هنا (في اورشليم). وسننشيء لها فروعا في سائر الانحاء خاصة تلك التي لم ينتشر فيها المبشرون بتعاليم الدجال اليسوع وشرائعة التي جاء بها، وسنها متجاسرا، فبذلك يامولاي نوحد القوة المنشودة التي بها نناهض ونحارب ونلاشي تلك القوة التي تهدد كياننا.

ودمتم جلالتكم ابد الدهر باحترام وقوة

عبدكم المخلص للعرش حيران ابيود)

واتە: (پاشای گەورەم: کاتیَ منی خزمەتکارو ڕاوێژکاری ملکەچی فەرمانە بەرزەکانی ئێوە بینیم هیچ فڕوفێڵێك لەوەدا نییە ڕاوبۆچوونی پەرش و بڵاومان یەکبخەین، هیچ هێزێك جێگەی ئومێد نییە ئەو هێزە لابدات کە بێشك هێزێکی نهێنییە, تەنیا بەدروستکردنی هێزێکی وەك ئەو نهێنی نەبیَ، بۆیە ئەگەر لە دیدی ئێوەی خاوەنشکۆ پێشنیاری بەندەتان کارێکی پەسند بیَ، پێم وایە کارێکی دروست و ئەرکێکیشە کۆمەڵەیەکی خاوەن هێزێکی مەزنتر لەو پێکبهێنین، ئەو هێزە جوولەکەیە لەخۆبگرێت کە لەلایەن ئەو هێزە نهێنییەوە هەڕەشەیان لەسەرە، نابیَ هیچ کەسێکیش ئاگاداری دامەزرێنەرو بوونی و پرەنسیپ و کارەکانی بێت تەنیا ئەو کەسە نەبیَ لەنێویدایە، ڕێگە نادەین هیچ کەسیَ بەوە بزانیَ ئێمە ئێستا دامانمەزراندووە تەنیا ئەو دامەزرێنەرانە نەبیَ کە ئێوەی خاوەنشکۆ هەڵی دەبژێرن. سەبارەت بە بڕیارە نهێنییە گرنگەکانیش نابیَ کەس بیزانیَ تەنیا ئەوانە نەبن کە ئەندامی تەواون تێیدا، ناوەندەکەشی لێرە لە (ئۆرشەلیم) دەبیَ. دواتر لە هەموو شوێنێك لقی لیَ دادەمەزرێنین، بەتایبەتی ئەو شوێنانەی مژدەدەرانی ڕێنماییەکانی یەسوعی دەجال و ئەو شەریعەتەی کە هێناویەتی و بەشێوەیەکی بوێرانە دایپشتوون، تێدابڵاونەبۆتەوە. بەمە گەورەم ئەو هێزە خوازراوە یەك دەخەین کە بەهۆیەوە هەڵدەستینەوەو ڕادەپەڕین و دەجەنگین و ئەو هێزە دەپلیشێنینەوە کە هەڕەشە لە بوون و قەوارەمان دەکات.

هەموو كات شكۆدارو ڕێزدارو بەهێز بن
بەندەی دلسۆزی تەختتان حیران ئەبیود)

دەبێت بزانرێت سەرەتا (حیران) لە یاداشتەكەیدا، هێرشێكی توند دەكاتە سەر خودی مەسیح و لایەنگرانی، پێی وابووە سەرهەڵدانی ئەم ئایینە گەورەترین مەترسییە بۆ سەر مرۆڤایەتی بەگشتی و خودی جوولەكە بەتایبەتی، هەروەها بۆچوونەكانی خۆی وا دەخاتە بەر دەستی پادشا: ئەم هێزە (مەسیحییەت) هێزێكی نهێنی و شاراوەیە ودەیەوێت ئایین و بیروبۆچوونە ترسناكەكانی خۆی بەسەر خەڵكیدا بسەپێنێ، چوونكە مەسیح بە كار و ئامۆژگارییە تاریك و مەبەستدارەكانی دەیەوێت دڵ و دەرونی گەلی یەهودی هەڵبژێردراوی خوا لە خشتە ببات.

بەكورتی (حیران) ویستوێتی وا لە پادشا تێبگەیەنێت، ئەم ئایینە هەڕەشەیەكی گەورەیە بۆ سەر جوولەكە، چ وەك ئایین، چ وەك نەتەوە و نیشتیمان، بۆیە پێویست دەكات ئێمەش هێزێكی نهێنی هاوچەشنمان هەبێت، تاكو بە گژ پیلان و كاری دوژمنكارانەی ئەم هێزەدا بچێتەوە و بەرگری لە ئایین و كیانی جوولەكە بكات. دواتریش باس لە چۆنێتی پێكهێنانی ئەم ڕێكخراوە نهێنییە دەكات، هەروەها جەخت لە سەر ئەوە دەكاتەوە دەبێت بارەگای ئەم ڕێكخراوە نهێنییەی جولەكە لە (ئۆرشەلیم) بێت، پاشان لە شوێنەكانی تری تایبەتیش لق وبارەگای تری هەبێت.

دوای ئەوەی (هیرۆدۆس) ئەم یاداشتە دەخوێنێتەوە، کە بەردی بناغەی دامەزراندنی کۆمەڵەی (هێزی شاراوە) دەبێت، یەکسەر بە شادومانییەوە ڕەزامەندی خۆی دەردەبڕێت بۆ پێکهێنانی ئەم کۆمەڵەیە و لەبەرانبەردا زۆریش ستایشی (حیران) دەکات کە لە بنچینەدا خاوەنی ئەم بیرۆکەیەیە، پاشان داوا دەکات بۆ ئەم مەبەستە ڕاوێژ بە (مۆاب)ی دەستە ڕاستی بکرێت، بۆ زیاتر دانان و پتەوکردنی بەردی بناغەی ئەم کۆمەڵەیە.

بۆیە لە ڕۆژی (٢٦حوزەیرانی ساڵی ٤٣)ی زایینی، پادشا (هیرۆدۆس) لەگەڵ (حیران) و (مۆاب لاني)دا کۆدەبێتەوە، لەم کۆبوونەوەیەدا پادشا کۆمەڵێك بیر و سەرنجی خۆی لە مەڕ دامەزراندنی ئەم کۆمەڵەیە باس دەکا و تێیدا جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە، دەبێت پەلە بکرێت لە دامەزراندنی، کە بێگومان دەبێتە مایەی یەکدەنگی و یەك ڕیزی نەتەوەی جوولەکە، هەروەها داوای ئەوەش دەکات کۆمەڵێك هاوڕێی تریش لەم پرۆژەیەدا هاوبەشییان بکات، وەلێ دەبێت ئەمانە کەسانێك بن نهێنی پارێز و جێگای بڕوا بن و زۆریش دڵسۆزبن بۆ ئایینی جوولەکە و چۆنێتی پاراستنی لە هەر هەڕەشە و کارێکی دوژمنکارانە، هەر لەم وتەیەدا پادشا زۆر سوپاس و ستایشی (حیران) دەکات کە هەوێنی ئەم بیرۆکەیە بووە، دوای دانانی هەندێك ڕێنمایی وئامۆژگاری و هێمای نهێنی، بەفەرمی بڕیاری پێکهێنانی ئەم کۆمەڵە شاراوەیە دەدەن، هەروەها لە سەر

ئەم ناوانەی لای خوارەوە ڕێکدەکەون وەك دەستەی دامەزرێنەری کۆمەڵەکە:

| پادشا هیرۆدۆسی دووەم (ئەغریپا) | سەرۆکی کۆمەڵە |
| --- | --- |
| حیران ابیود | جێگری سەرۆك، خاوەنی بیرۆکەکە |
| مۆاب لافی | نهێنی پارێزی کومەڵە، دەستەی دامەزرێنەر |
| جوهنان | ئەندامی کۆمەڵە، دەستەی دامەزرێنەر |
| انتیبا | ئەندامی کۆمەڵە، دەستەی دامەزرێنەر |
| جاکوب ابدون | ئەندامی کۆمەڵە، دەستەی دامەزرێنەر |
| سلومون ابیرون | ئەندامی کۆمەڵە، دەستەی دامەزرێنەر |
| جواب ادونیرام | ئەندامی کۆمەڵە، دەستەی دامەزرێنەر |
| ابیا لافی | ئەندامی کۆمەڵە، دەستەی دامەزرێنەر |

بەمەش هیرۆدۆس بە هاوکاری حیران و ڕاوێژکارەکانی بەردی بناغەی (هێزی شاراوە) دادەنێت و خۆی دەبێتە یەکەم سەرۆك و حیرانیش بە جێگر، دەتوانرێت ئەم کۆمەڵەیە بە کۆنترین وگرنگترین ڕێکخراوی نهێنی جولەکە لە مێژوودا بێتە ئەژماردن، پاشان هەر (٩)ئەندامە دامەزرێنەرەکەی سوێندی تایبەت دەخۆن، کە بەم شێوەیە بووە: (انا فلان بن فلان، اقسم بالله وبالتوراة بانني حيث

صرت عضوا من الاعضاء التسعة الاعضاء المؤسسين جمعية القوة الخفية اتعهد الا اخون اخواني الاعضاء بشيء يضر بشخصيتهم، ولا بكل ما يعود لمقررات الجمعية، اتعهد بان اتبع مبادئها، واتمم كل ما نقرره باتفاقنا نحن التسعة المؤسسين بكل دقة وطاعة وضبط، وبكل غيرة وامانة، اتعهد ان اجتهد بتوفير عدد اعضائها، اتعهد بمناهضة كل من يتبع تعاليم الدجال يسوع، ومحاربة رجاله حتى الموت، اتعهد بان لا ابوح باي سر من الاسرار المحفوظة بيننا –نحن التسعة– لاي كان من الخارجين او من اعضائها. واذا خنت بيميني هذه وثبت خيانتي باني بحت باي سر، وباية مادة من مواد قانونها الداخلي، المحفوظة لنا نحن، ولحلفائنا فقط، يحق لهذة العمدة الثمانية، رفقائي ان تميتني باية طريقة كانت ).

ئەم جۆرە سوێند خواردنە، ڕەنگە لە مێژوودا کەم بێت چ لە ڕووی تایبەتمەندی و برگەکانییەوە چ لە ڕووی ئاستی وابەستەبوون و ترس و پاراستنی نهێنییەکانەوە، کە سوێندخۆر بە تەواوەتی ملکەچی دابەونەریت و یاسا و ڕێساکانی ئەم کۆمەڵەیە دەکات و پیرۆزییەکی گەورەی پێ دەبەخشێت، وا بە ئاسانی نەتوانێت ئەندامێتی خۆی هەڵبوەشێنێتەوە، یان بچوکترین نهێنی و تایبەتمەندی ئاشکرا بکات، دواتر دەستەی دامەزرێنەر بە ئامادەبوونی پادشا هیرۆدۆس، بەردی بناغەی یەکەم (محفل) دادەنێن و ناوەکەشی (محفل اورشلیم) دەبێت. ئەم هێزە شاراوەیە کۆمەڵێك ڕێوڕەسم و داب و نەریت و یاسا و هێما و ئاماژە بۆ خۆی

دادەنێت، بۆ کاتی مەراسیم و چۆنێتی بە جێگەیاندنی ڕێوڕەسم و کارو بەرنامە نهێنییەکانیان، بەمەبەستی گەیشتن بە ئامانجە بالآکانی، دەکرێت فاکتەرەکانی پشت دامەزراندنی ئەم هێزە بە زۆری بریتی بن لە:

- دامەزراندنی هێزێکی شاراوە و تایبەت بە بەرژەوەندییەکانی جولەکە.
- پاراستنی ئایین و نەتەوەی جولەکە لە هەر هێرش و پەلامارێکی دەرەکی و دوژمنکارانە.
- دژایەتیکردنی مەسیحییەت و پیاوانی ئەم ئایینە، هەروەها ڕێگە گرتن لە بلآوبوونەوە و تەشەنەسەندنی لە ناوچەکەدا.

دواتر دێینە سەری و دەبینین هاوشێوەبونێکی زۆر بە دی دەکرێت لە نێوان هێزی شاراوە و کۆمەڵەی ماسۆنیزمدا، زۆربەی شارەزایان بە تەواوکاری یەکتریان دەزانن.

# ئەلغەنوسییە (الغنوصية /العرفانية)

مێژووی ئەم ڕێکخراوە دەگەڕێتەوە بۆ سەدەکانی پێش سەرهەڵدانی مەسیحییەت، دواتریش پەلی هاوێشتووە بۆ ڕۆژهەلاتی ناوین، یەکێك لە ڕەمز و دروشمەکانی وێنەی (ئەبراکساس abraxas/)ە، بریتییە لە لەشی مرۆڤ و پۆشاکی سەربازی لە بەردایە، بە دەستی ڕاستییەوە باڵتەیەکی شەڕی هەڵگرتووە، ئاماژەیە بۆ هەڕەشەکردن لە دوژمن، بەدەستی چەپیشییەوە قەڵخانێکی سپییە و زۆرجار تێیدا وشەی هێز یان (سابوت)ی لە سەر نوسراوە، ئەم جەستەیە نیوەی لە وێنەی مرۆڤدایە، سەری بریتییە لە کوڵەوەی بابێك وهەردوو قاچیشی دوو ماری دوو وانەن.

ئەم گروپە پابەندی هیچ ئاینێکی دیاریکراو نەبوونە، یان بۆ خۆیان هیچ ئاینێکی تایبەتیان نەبووە تاکو بیپەرستن، تەنها وێنەی (ئەبراکساس) نەبێت، هێمایەك بووە بۆ بوونی هێزێ کە دروستکاری ئاوەزی مەزنە، یان خاوەن توانایەکی گشتی بووە، چوونکە هەر یەك لەو پارچانەی کە لە وێنەکەدا هاتوون، ئاماژەیەکن بۆ مەسەلەیەك کە پیرۆزی و گرنگی خۆی هەبووە لای ئەم گروپە.

ئەلغەنوسییەکان خۆیانیان وادەبینی دەستبژێریکی عەقلانین وتەنها ژمارەیەکی تایبەت دەتوانن لەمان بگەن، چوونکە هەر

کەمینەیەك لە خەڵك دەتوانن لەم پەیام و تایبەتمەندییان تێبگەن، هەر ئەمەش وای کردووە وەکو گرێیکی نهێنی داخراو بمێننەوە، ئەم سروشتەیان وای کردبوو بۆ پاراستن و مانەوەیان بە نهێنی کۆمەڵێك هێما وشە و و جوڵەی نهێنی بە کاربهێنن بۆ هەڵسوکەوت و مامەڵەی ڕۆژانەیان.

لە ڕاستیدا ئەم کۆمەڵە شاراوەیە ئایینی نەبووە وەك هەر بیر و باوەڕێکی تری نێو ئایینەکان، هەرچەندە لە گەڵ تێپەڕبوونی ڕۆژگاردا دانیان بە ڕێباوەڕی (الظاهرية)دا نا لە هەموو ئاینەکاندا، ئەمان سودیان لە هەموو سیستەمە ڕامیاری و ئاینیەکان دەبینی، بەمەش غەنوسییەکان کاریگەری قوڵیان لە سەر ئاوەزی خەڵك دانا بوو، بە تایبەتی لە ئەوروپادا و بەتەواوی لە سەدەکانی ناوەڕاست ودواتریش. پەیڕەوکردنی هەندێك باوەڕ و بەکاربردنی چەندین نهێنی عیرفانی، بە تایبەتی پەنابردنە بەر جادوو و بەردە پیرۆز و ڕەنگرێژەکان و چەندین ناو وشەی شاراوە، هەموو ئەمانە فاکتەری بابەتی بوونە بۆ کاریگەری خستنە سەر خەڵك تاکو بڕوا بە گروپی (الغنوصية) بهێنن و ئومێد بە بیروباوەڕو پەیامەکانیان بهێنن، لە ڕووی بڕوا و ئاکاریشەوە، ئەم گروپە وەکو زۆریك لە گروپە فیکری و ئایینییەکان بڕوایان بە بوونی هەردوو هێزی (الخير والشر) هەبووە، پێیان وابووە بۆ ڕاگرتنی هاوسەنگی لە نێوان هەردوو هێزدا، تەنها غەنوسیەکان دەتوانن ئەم کارە ڕابگرن.

غەنوسیەکان لەو ڕۆژگارەدا توانیویانە وەکو گروپێکی نهێنی، کاریگەری قووڵ لەسەر کۆمەڵگە دابنێن و تاڕادەیەك ئەگەرچی بە شێوەی داب و نەریت و باوەڕە نهێنییەکانی خۆی بەسەر ئەندام و لایەنگرانیدا بسەپێنێ، بۆیە کاتێك دیقەتی تایبەتمەندی زۆریك لە ڕێکخراوە نهێنییەکانی مێژوو دەدەین، دەبینین لە چەندین بواردا جۆرێك لە هاوشێوەبوون یان چوونیەکی لە نێوانیاندا هەیە، بە تایبەتی لە نێوان غەنوسی وگروپە نهێنییەکانی جولەکە، بۆ نموونە:

- پێش سەرهەڵدانی مەسیحییەت و دواتریش دەبینین تێکەڵەیەك یان نزیکییەك هەبووە لە نێوان جوولەکە وغەنوسییەکاندا، هەر بۆیە یەکێك لە گروپەکانی جوولەکە بە غەنوسی ناودەبرا.
- پەنابردنی هێزی شاراوە (القوة الخفية) بۆ ڕەمز و هێما و نهێنی، لە هەمان کاتدا گەر سەرنج بدەین هەمان شێواز لای غەنوسیەکانیش کاری پێکراوە.
- غەنوسیەکان پەنایان دەبردە بەر جادوو، کەچی وەك زانراوە گروپێکی جوولەکە بە ناوی (القبالة اليهودية)یش هەمان کاریان دەکرد.

# حەشاشەکان (الحشاشون)

دوای سەرهەڵدانی ئیسلام لە نیوە دورگەی عەرەبیدا، چ لە پەنای ئەم ئاینەدا و چ لە دژ و ڕکەبەرایەتیدا، چەندین گروپ وتاقمی دژبەیەك پەیدابوون، هەر یەکەیان بە جۆریك لە جۆرەکان و بە جیاواز لە بنەماکانی ئیسلام یان جیاواز لە گەڵ هەندێك باوەڕ و بنەمای ئیسلامیدا هاتنە کایەوە، بەبنەما و فۆرمی تایبەت بە خۆیان هاتنە مەیدانی کار.

ڕێکخراویی (الحشاشون) وەك هەر کۆمەڵەیەکی نهینی، لە نێو کۆمەڵگەدا دروستبوون، وەك دیارە لایەنگرانی ئیسلام لە سەدەی حەوتی زایینیدا دابەشبووبوون بۆ سەر دوو گروپ یان دوو ڕێباز و باوەڕ، سوننە کە موحەممەدی پێغەمبەریان بە سەرچاوە و ڕێبەر دەزانی، هەرچی شیعەشە بایەخی زیاتریان بە ئیمامی عەلی دەدا، سەرباری ئەوەی بە ئاشکرا نەیاندەتوانی نکۆڵی لە بوونی موحەممەد بکەن وەك نێردەی خوا، ئەمە سەرەتای سەرهەڵدانی ناکۆکی و کێشەکانی نێو دونیای ئیسلامی بووە.

شیعەکان هەر لە دەستپێکەوە بۆ خۆپارێزی پەنایان دەبردە بەر کاری نهێنی و دروستکردنی ڕێکخراوی شاراوە بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانیان، هەرچەندە ئەم گروپە کەمینە بوونە بە بەراورد

بەسوننەكان، وەلێ هەمیشە لەو باوەڕەدا بوونە ڕۆژێك دادێ دەتوانن شكست بە زۆرینە بهێنن، ئەمەش زیاتر هانیدان تاكو لە چوارچێوەی تاقم و گروپی شاراوەدا كاری نهێنی و ژێر بەژێر بكەن، بۆ گەیشتن بە ئامانج و مەبەستەكانیان، بەو ئومێدەی ببنە سەرداری هەموو جیهان.

دیارە لە سەر ڕەگ و ڕیشەی ناوی ئەم گروپە بۆچوونی زۆر هەن، بە نموونە (احمد امین) دەڵێت: ئیسماعیلییەكان دەگەڕێنەوە سەر ئیمامی ئیسماعیل، كە حەوتەم ئیمام بووە، هەر بۆیە بەلایەنگرانی دەڵێن (السبعیة) هەندێكجار بە تاقمێك لەمانە دەڵێن (الحشاشون) لەبەر ئەوەی بۆ سەرخستنی بانگەوازەكەیان حەشیشیان بە كار دەهێنا، هەندێكیشیان بە (الفدائیین) ناوزەد دەكران. بەم پێیە بێت حەشاشەكان بەشێكن لە تاقمی ئیسماعیلییەكان، بەڵام بە هەندێك جیاوازی كەمەوە، چوونكە ئەمان ترس و تۆقاندن و حەشیشیان بەكاردەهێنا لەناو لایەنگر و هەوادارانی خۆیاندا، ئەمەش لە بەر دوو فاكتەری سەرەكی:

یەكەم: بە مەبەستی پاراستنی نهێنی گروپەكەیان.

دووەم: تاكو هیچ كەس لەئەندامەكانی بە ئاسانی نەتوانێ، ئەندامێتی خۆی هەڵپەسێرێ واز لەم ڕێكخراوە بهێنی.

ئەوەش كە پێویستە هەنووكە لە سەری بوەستین، باس و خواسی حەسەن سەباحی شێخی چیاكانە، لە بنەچەدا خەڵكی دەڤەری خۆراسانی وڵاتی ئێرانە، دوای ئەوەی ئەكەوێتە ژێر

کاریگەری بیروبۆچوونی ئیسماعیلییەکانەوە، هەر بۆ ئەو مەبەستەش سەردانی وڵاتی میسر دەکات، پاشان دەگەڕێتەوە ئێران و بەفۆرم و ریتێمیکی جیاوازترەوە دەکەوێتە کار، لێرەو لەوێ لایەنگر و هەوادار بۆخۆی پەیدا دەکات، شێخی چیاکان زیاتر لە ئیسماعیلییەکانی قاهیرە، پەنا دەباتە بەر کاری نهێنی و شاراوە، هەرگیز سانا نەبووە بۆ کەسێکی تر لەدەرەوەی ئەم رێکخراوە بتوانێت لەو سەردەمەدا کەمترین زانیاری لەبارەیانەوە هەبێت، ئەم گروپە بۆ سەرخستنی پەیامەکەیان، کۆمەڵێك بابەتیان پەیڕەو دەکرد، بە تایبەتی لە قەڵای مەرگ (قلعة الموت)دا، وەك:

- هەمو هەڵسوکەوت و جوڵە و کارکردنێکیان دەخستە خانەی نهێنی و بەکاربردنی سیمبول و ئاماژە و هەندێك جوڵەی جەستە و روخسارەوە، تەنانەت شوێن و جێگا گرنگەکانیان هەموو کەس پێی نەدەزانی لە کوێن و چۆن بۆی دەچن.
- بەکارهێنانی ترس و تۆقاندن، بەتایبەتی لەنێو ئەندامەکانیاندا.
- وەرگرتنی ئەندام، دەبوایە بە چەندین قۆناغ و تاقیکردنەوەی پڕ لەترس و تاقەت پڕوکێندا بوایە.
- بەکارهێنانی سیاسەتی دیماگۆجی و خەڵك خەڵەتاندن بۆ پەیداکردنی ئەندام و هەوادار و پێدانی مژدەی بەهەشت...هتاد.

- بۆ چاوبەستن و لەخشتەبردن و ئاشکرانەبوونی نهێنی و ڕێوڕەسمە تایبەتییەکانیان، مادەی هۆشبەری حەشیشەیان بەکار دەهێنا، هەر بۆیەش ئەم ناوەیان بڕاوە بەبەردا.
- ئەنجامدانی کاری ژێر بەژێر و تیرۆرکردنی نەیارەکانیان، بۆ نموونە: لە ساڵی(١١٠٠)زایینی ئەم گروپە (٣٦٠)میر و سەرکردەی دیاری موسڵمانیان کوشتووە.

هەروەها ئەم گروپە بەوە تاوانبارکراون، کە هاوسۆز و هاوکار بوونە لە گەڵ خاچدروشمەکان لە دژی موسڵمانان، چوونکە حەسەن سەباح و هەوادارانی دژی فەرمانڕەوایەتی عەباسی بوونە و هەمیشە لە ململانێی توند دابوونە، ئامانجی سەرەکییان ئەوە بووە، دەسەلاتی هەموو ناوچەکە بگرنە دەست و تەنها خۆیان فەرمانڕەوابن، هەر بۆیە لە گەڵ ڕۆژگاردا ژمارەی ئەندام و هێزیان زیاتر بووە و بونەتە هێزێکی گەورە و کاریگەر و تۆقێنەر، دەگێڕنەوە جارێکیان خودی حەسەن سەباح وتویەتی خاوەنی (٧٠)هەزار لایەنگرم لە ژن و پیاو لە هەموو ئاسیادا، هەر هەمووشیان ئامادەن فەرمانەکانم جێ بەجێ بکەن.

حەشاشەکان کۆمەڵێك ئاماژە و هێما و پیت وێنەیان هەبووە، وەك ئامرازێك بۆ یەکترناسین و گفتوگۆی بێ قسە بەکاریان هێناوە، بۆ لەیەك تێگەیشتن. هەروەها بۆ وەرگرتنی ئەندام و گەیشتن بەپلەکانی بەرپرسیارێتی لەم ڕێکخراوە و کار و ڕەفتار و هەڵسوکەوتی نهێنی، چەندین یاسا و داب و نەریتی تایبەتیان

هەبووە. دوای کوشتنی (حەسەن سەباح)یش ئیدی (کیا بوزریق) بووە بەکەسی یەکەمی ئەم ڕێکخراوە، ماوەیەکی زۆر ئەم گروپە لە ناوچە جیاجیاکانی ئاسیا بوونیان هەبووە و کاریان کردووە.

# نورانییەکان (النورانیون)

سەدەی شازدە  وڵاتی ئەفغانستان سەرهەڵدانی کۆمەڵەیەکی بەهێزی بەخۆوەبینی، کە دەستپێك بەکۆمەڵێك یاسا و ڕێسای نهێنییەوە لەچیاکانی ئەو وڵاتە هاتنەبوون و پێیان دەوترا (الروشانیة) یان (النورانیون)، وشەی ڕۆشانییەکان لەبنەچەدا وشەیەکی ئەوروپییە، خاوەنی کتێبی (تاریخ الجماعات السریة) واتای وشەکەی بە ڕووناکی لێکداوەتەوە، هەرچەندە بۆچوونی تریش هەیە وشەی (ڕۆشی) بە تاوێر (الصخرة) داناوە، گەر سەرنج بدەین بۆچوونی یەکەم  دروستترە، بۆ نموونە لە زوبانی کوردیشدا وشەی ڕۆشن بەئاوێکی پاك و بێگەرد دەوترێ، یان کاتێك تاریکی شەو پاشەکشە دەکات، دەوترێت دونیا ڕۆشن بووەتەوە، یان ڕووناك بوەتەوە.

وەك شارەزایان ئاماژەی بۆ دەکەن، بەشێك لەنهێنی و مێژوو و داب و نەریت و ڕێساکانی ئەم تاقمە نەماون یان ونبوونە، هەر بۆیە لاپەڕەکانی مێژوویان زۆر بەڕۆشنی نایاتە بەرچاو و کەمترین زانیاریش لە بەردەستدان. کەسی یەکەمی ئەم کۆمەڵەیە ناوی (بایزید الانصاري الافغاني)ە، خانەوادەکەی خۆیان بە نەوەی (سلالة الانصار)ی زانیوە، بایەزید سەرەتا پەیوەندی بە ئیسماعیلییەکانەوە

بووە، ئەگەرچی باوکی موسڵمانێکی سوننی بووە، وەلیّ ئەم لە ژێر کاریگەری کەسێکی ئیسماعیلییەوە بیر و باوەڕی خۆی دەگۆڕێت.

سەرەتا بایەزید قوتابخانەیەکی بچووك دادەمەزرێنی، خۆی سەرقاڵ دەکات بەوانە وتنەوە بەو خوێندکارانە، بەتایبەتی لەسەر بابەتی (ما فوق الطبیعة) لە ماوەی (٣) ساڵدا دەتوانیّ (٥٠) فێرخۆاز پەروەردە بکات لەسەر بیروبۆچوونەکانی خۆی، تاکو وردە وردە ئەندام و لایەنگرانی ڕوو لەزیادبوون دەکەن، بەمەش بۆ ئەو سەردەمە ترس و دڵەڕاوکیّ دەخاتە نێو دڵ و دەروونی دەسەڵاتدارانی ئەفغانستانەوە، بەپێی ئەو نامانەی کە لە لایەن ئەم کۆمەڵەیەوە نوسراون، ئامانجیان بە پێی خشتەیەك سەرلەنویّ دانانەوەی سیستەمی کۆمەڵایەتی جیهان بووە، ئەمەش لە ڕێگای گرتنە دەستی دەسەڵاتەوە بووە لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر، تاکو هەموو جیهان بخەنە ژێر دەسەڵات و فەرمانڕەوایەتی خۆیانەوە.

نورانییەکان، وەکو باقی کۆمەڵە و گروپە نهێنییەکانی تری دونیا، بۆ وەرگرتنی ئەندام کاریان بە پلەبەندی کردووە، کەسێك ببوایە بە ئەندام لەم ڕێکخراوەدا دەبوایە بەچەند قۆناغێکدا گوزەری بکردبایە، پلەکانی پەیوەندیکردن و ئینتیما بەم شێوەیە بووە:

یەکەم: پەیڕەوکار (السالك).

دووەم: مورید (المرید).

سێیەم: هەژار (الفقیر).

چوارەم: عاریف (العارف).

پێنجەم: گەورە (الخواجە) یان (السید).

شەشەم: میر (الامیر).

حەوتەم: پێشەوا (الامام).

هەشتەم: پادشا (الملك).

کەواتا هەشت پلە لە نێو ئەم ڕێکخراوەدا بوونی هەبووە وەکو هەیکەلی تەنزیمی، بێگومان هەر یەکێك لەم قۆناغانە خەسڵەت و تایبەتمەندی خۆی هەبووە، مەسەلەی ئەندام بوون هەروا کارێکی ڕۆتین و سەرپێی نەبووە، دیارە پەیتا پەیتا ژمارەی ئەندامەکانیشیان ڕووی لەهەڵکشان بووە.

بایەزید ناوەندی سەرکردایەتی لە چیاکانی ئەفغانستانەوە دەخاتە جوڵە و دەکەوێتە هەڵپەی دروستکردنی قەڵایەکی گەورە و فراوان، بۆ ئەوەی ببێتە خاڵی سەرکردایەتی و هەڵمەتەکانی سەربازی بۆ سەر ناوچە و دەڤەرەکانی تر، هەروەها بەپێی بەرنامەیەك نوێنەری خۆی ڕەوانەی ناوچە جیاجیاکان دەکات، بەمەبەستی ملکەچکردنی هەموو گەلانی ڕۆژهەڵاتی ناوین بۆ فەرمانڕەوایەتی خۆی، بەلام وەك دەگێڕنەوە ئەم هەنگاوەی سەرکەوتن و پاڵپشتی کەمی بە دەست هێناوە، چوونکە بانگەشەکانی هەروا ئاسان نەبووە لەنێو گەلانی ئیسلامیدا قبوڵ بکرێت.

پاشان بایەزید نازناوی پیری ڕۆشان (حکیم النور) بۆ خۆی دادەتاشێ و شارێك لە (هاشتنجار) وەك ناوەندێك بۆ بلاوبوونەوەی

نورانییەت دروست دەكات، تاكو لەوێوە ڕێباز و بیروباوەڕەكەی بە جیهاندا بڵاوبكاتەوە، بۆ هەر كەسێكیش كە دەبووە ئەندام نازناوێكی بۆ دادەنرا بەپێی ئەو ئەركەی بۆی دیاریكرابێت، بۆ یەكترناسین و هەڵسوكەوتی ڕۆژانە لەگەڵ یەكتردا، كۆمەڵێك جوڵەی ئەندامەكانی لەش و بەكارهێنانی چەند هێمایەكی نهێنی بووبوونە ئامرازێك لە نێو ئەم گروپەدا، ئەمەش یەكێكە لە خاڵ و خەسڵەتە هاوبەشەكانی نێوان ڕێكخراو و گروپە نهێنییەكان لە مێژوودا، زۆرترین ئەو كەسانەش كە دەبوونە ئەندام و لایەنگری ئەم كۆمەڵەیە، بریتیی بوونە لەخاوەن پیشە وەك بازرگان وەستای دروستكردنی خانو بەرەو پیشەزانەكانی تر.

هەموو ئەم لە یەكچوونانە ئەو بڕوایەی لای توێژەر و زانایان دروستكردووە، كە هاوشێوەیی و نزیكایەتی لە نێوان نورانی و ماسۆنییەتدا هەیە، هەر هیچ نەبێت دەكرێت وای بێنینە ئەژماردن خودی ماسۆنیزم سودی لەزۆر تایبەتمەندی و ڕێوڕەسمی نورانییەكان وەرگرتووە.

لە سەدەی نۆزدەدا، لێكۆڵەرێكی ئەفغانی، تاڕادەیەك لەژێر كاریگەری ئەو گروپەدا بووە، كتێبێكی قەبارە گەورەی لەسەر ئەم هێزە نووسیووە و جەختی لەسەر ئەوە كردووەتەوە ئامانج و كاری سەرەكییان گوایە دژایەتیكردنی مەغۆل بووە، هەروەها هەموو ئەو كار و ڕەفتارە خوێناوی و شەڕانگێزانەی كە بە مێژوویانەوە لكاوە،

هەمووی بەدرۆ دەخاتەوە و پێی وابووە ئەم گروپە تیرۆرست و پیاوکوژ نەبوونە.

پاشان ئیمپراتۆری مەغۆل فەرمانی گرتنی (بایەزید) دەدا و لەناو شاری (کابول)دا دەیبەستێتەوە و لایەکی سەرو ڕیشیشی دەتاشێت، دواتر لەسەر داوای ڕێبەرێکی ئایینی ئەو وڵاتە حاکمی مەغۆل بایەزید ئازاد دەکات، دوای ئازادکردنیشی جارێکیتر دەکەوێتە هەڵپەی کۆکردنەوەی سەرباز و چەك و کەرەستەی جەنگ، ئینجا دەکەوێتە بانگەشەی ئەوەی پێویستە وڵاتی هیند و فارس بەجەنگ تێکبشکێنرێت، دوای چەندین شەڕو پەلاماری یەك لەدوای یەك، سەرئەنجام ئەم کۆمەڵەیە بۆ سەر دوو تاقمی شەڕکەر و بانگەشەکەری ئایینی دابەش دەبێت، دواتریش ئەوەی دەمێنێتەوە تەنها گروپی بانگەشەکارانی ڕێباز وباوەڕی نورانییە و ئەوی تریان دەپوکێتەوە.

دوای چەندین ساڵ، لە وڵاتی ئەڵمانیا و لەچەندین شوێنی تری جیهان، بە هەمان فۆرم و ناو و ڕێساوە ژمارەیەك گروپی هاوشێوە لە ژێر ناوی نورانییەکاندا سەر هەڵدەدەن، بە تایبەتی لە ئیسپانیا و و فەرەنسادا، بە پێی بەڵگەکانیش کەهەن، لە زۆر بواردا نورانییەکانی ئەفغانستان وڵاتی ئەوروپا لە یەك دەچن و تا ئەندازەیەك هاوشێوەن، بەڵام تەنها کۆمەڵێك گۆڕانی کەمیان بەسەر چەند یاسا و ڕێسایەکدا هێنا بوو.

گەر تێبینی بکەین، دەبینین ئەگەرچی لەئامانجدا هەندێك جیاوازی هەیە لەنێوان ئەم کۆمەڵە و ماسۆنیزمدا، وەلێ لەهەمان کاتدا هەست بەجۆریك لە هاوشێوە بوون دەکرێت لەنێوان هەردوو کۆمەڵەدا، بۆ نموونە:

- نورانییەکان ڕێکخراوێکی نهێنی بووە و وەرگرتنی ئەندامیش بە پێی پلەبەندی بووە، کەچی بەهەمان شێوە ماسۆنییەتیش بەنهێنی کاریکردووە و دەکات.
- ئەندامەکانی هەمیشە دووچاری گوێڕایەڵی کوێرانە کرابوون، کەلە ماسۆنییەتیش دا هەمان شێوە بووە.
- دژایەتیکردنی زۆربەی بنەما و ڕێسا ئایینیەکانی ئیسلام، لەبەرانبەردا خودی ماسۆنیزم دژایەتی هەموو ئاینەکان دەکات، بەتایبەتی هەردوو ئایینی ئیسلام و مەسیحییەت.
- بەکارهێنانی توندوتیژی و تۆقاندن، لە بەرانبەر ئەنداماندا لەکاتی خیانەت و لاداندا.
- بەکارهێنانی سوێندخواردن لای هەردوو کۆمەڵە.
- بڕینی پلەکان بە شێوەی قۆناغ بەندی لای هەردوو کۆمەڵە.

نورانییەکان چ لە ئەفغانستان و دواتر چ لەئەوروپایش خاوەنی چەندین خەسڵەت و تایبەتمەندی و نهێنی ترن..

# بزوتنەوەی بابی و بەهائی (البابية والبهائية)

ڕەنگە هاتنی ناوی ئەم دوو بزوتنەوەیە بەیەکەوە، هەر لە بنەڕەتەوە گرفتێك بۆ خوێنەر دروست بکات، دەبێت ئەو ڕاستییە بزانرێت هەردوو بزوتنەوەکە تەواوکاری یەکن، بەڵام لە ڕووی ڕێبەرایەتی و دواتر دابەشبوونەوە بۆ سەر دوو بەرە، ئەم حاڵەتە یان ئەم دوو ناوە دروست بووە، وەلێ لە ڕووی سەرهەڵدان و بەشێك لەبنەماکانییەوە ناکرێت بەتەواوەتی مێژوویان لە یەکتر جودا بکرێتەوە.

لە سەرەتای نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەوە، گروپێکی بەڕواڵەت ئایینی سەرهەڵدەدات و دەبێتە یەکێك لەو گروپە توندڕەوانەی بەتوندی دژایەتی ئیسلام و بنەماکانی دەکەن، ئەو گروپەش ناوی (البابية) و لەولاتی ئێرانەوە سەرهەڵدەدات، وەك پێشتر ئاماژەمان بۆی کرد ئەم گروپە یەکەم و دوا گروپی نهێنی توندڕەو نەبووە لە مێژووودا کە ولاتی ئێران بەخۆیەوە بیبینێت، وەلێ ئەم ولاتە لە بەر چەندین فاکتەری جیاجیا لانکەی سەرهەڵدانی کۆمەڵێك گروپی لەم جۆرە بووە لە قۆناغە جیاجیاکان دا.

ناوی ئەم بزوتنەوەیە دەگەڕێتەوە بۆ ناوی ڕێبەر و دامەزرێنەری ئەم بزوتنەوەیە، ئەویش (میرزا علي محمد الشيرازي)یە، لەدایکبووی شاری شیرازی ئێرانە لەساڵی (١٨١٩)

هەرچی مێژووی بانگەشەکردنیشە بۆ بیرو باوەڕ و ڕێبازەکەی، بە ڕێکی دەگەڕێتەوە بۆ (١٨٤٤/٥/٢٣) و هەروەها نازناوی (الباب) یشی بۆ خۆی هەڵبژارد.

کورتەی بانگەوازەکەشی بریتیی بووە لەوەی پێغەمبەرایەتی بە موحەممەد کۆتایی پێنەهاتووە و ئەویش دوا پەیامبەر (خاتم الانبیاء) نییە، بەڵکو خوای گەورە هەر جارە و لەکەسێکدا کەسایەتی پەیامبەر دەنێرێت، بێگومان ئەمەش سەرەتایەك بووە بۆ نواندنی خۆی وەك پەیامبەر، سەبارەت بە مەهدی چاوەڕوانکراویش، ئەم زاتە بانگەشەی ئەوەی کردووە خۆی تاکە دەرگا و دەروازەیە بۆ گەیشتن بەو کەسایەتییە، بەو مانایەی تەنها خۆی شایستەی ئەو ناو و جێگەیەیە، دواتریش خۆی بە مەهدی چاوەڕوانکراو چواندووە، پاشتریش خۆی وەك پەیامبەر و نێردراوی خوا ناساندووە، لەگەڵ ئەمەشدا ئەوەی لەناو خەڵکدا بڵاویکەیاند کتێبی (البیان)ی بۆ هاتووەتە خوارەوە لەلایەن خواوەندەوە و بەمەش ئیدی قورئان نەسخ دەبێتەوە، دیارە ئەمە تێڕوانینی ئەم گروپەیە و بەدەرە لەتێڕوانینی بەندە، چوونکە ئەوەی ئێمە سەرنجمان دابێت ئەو ڕوانینەی سەرەوە تەنها دیدی دروستکراوی ئەم کۆمەڵەیەوە و هیچ لۆژیکێك لە پشت وەها تێڕامانێکەوە نییە، ئەم دیدانە لەمەڕ کتێبەکە و هەروەها بۆچوونەکان تەنها و تەنها دروستکراوی نێو زەن و بیری خودی دامەزرێنەری بزوتنەوەکەن و بەس، ئەگینا هیچ بەڵگەیەکی سەلمێنەر نییە لە دەرەوەی ئەدەبیاتی ئەم گروپە ئەوە

بسەلمێنی، بۆچوون و جیهانبینیان لەمەڕ ئەو مەسەلانەی کە بڕوایان پێیەتی ڕاست و دروست بن، ئەمەی لای خوارەوەش کۆمەڵێك بیروباوەڕ و ئامانجی ئەم بزووتنەوەیە:

- سەرخستنی (الباب).
- لادان و پچڕاندنی پەچەی ژنان و پێدانی تەواوی مافەکان بە ژنان.
- ڕێگە دان بە ژنان کەلە یەك کاتدا چەند شوویەك بکەن.
- بانگەشەکردن بۆ دابەشکردنی سەروەت و سامان.

دوای ئەوەی (البابیة) بەشێوەیەکی فراوان لەئێراندا گەشەی کرد، بەهەردوو ئاڕاستەی ئایینی و سیاسیدا کاری خۆی دەکرد، دواتر دەسەڵاتدارانی ئێران ناوبراو دەستگیر دەکەن و پاشان لەشاری تەبریز و لەساڵی (١٨٥٠) لەسێدارە دەدرێت، بۆچوونێکیش هەیە جەخت لە سەر ئەوە دەکاتەوە هەر لە گەڵ دروستبوونی ئەم بزوتنەوەیەدا، یەکسەر جوولەکەکانی ئێران پێشوازیان لێی کردووە و هاوکار و هاوسۆزبوونە بۆ گەشەکردن و بەرەو پێشبردنی، ئەمەش بەمەبەستی ئەوەیە گوایە ئەم گرووپە هەڵگری دروشمی یەکخستنی هەموو ئایین و باوەڕەکانی جیهان بووە، گوایە ئەم دروشمە هاوشێوەی دروشمەکانی ماسۆنیزمە، سەبارەت بە ژمارەی جوولەکەکانی ئێران لەنێو بزوتنەوەی بابیدا بەم شێوەیە بووە:

- لە تەهرانی پایتەخت (١٥٠) ئەندام.
- لە شاری هەمەدان (١٠٠) ئەندام.

- له شاری کاشان (٥٠) ئەندام.
- له کلیاکیان (٨٥) ئەندام.

ئەمەش بۆ خۆی بەڵگەیەکی حاشا هەڵنەگرە بۆ بوونی پەیوەندی لە نێوان جوولەکە و بزووتنەوەی بابیدا ئەوەشمان لەیاد نەچێت لەسێدارەدانی ڕێبەری یەکەمی ئەم بزوتنەوەیە، کاریگەری نەگەتیڤ بۆ سەر ئەندام و لایەنگر و ڕێبەرەکانی تریان بەجێ دەهێڵێت، لەئاکامدا حاڵەتی ناکۆکی و دابەشبوون دروست دەبێت و تەواوی ئەم بزوتنەوەیە بۆ سەر سێ گروپ دابەش دەبن بەم شێوەیە:

- کۆمەڵێك بانگەشەی ئەوەیان دەکرد، ئەوەی پێویستە جێگای کەسی یەکەمی بگرێتەوە (میرزا یحیی نور)ە، کە نازناوی (صبح ازل)ی هەڵگرتبوو، بۆیە ئەم گروپە بە (الازلية) ناسران.
- کۆمەڵێکی تریان پێیان باشبووە (میرزا حسین علي المازندراني) ببێتە ڕێبەری یەکەم، کە نازناوی (بهاء الله)ی هەڵگرتبوو، بۆیە ئەم گروپە بە (البهائية) ناسران.
- کۆمەڵی سێهەم نەچوونە پاڵ هیچ کام لەم دوو گروپە، بۆیە بە(البابية المخلصة) ناسران.

هەرچەندە ژێدەرەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن خودی (میرزا علی) پێش مردنی، جەختی لەسەر ئەوە کردوەتەوە، دوای خۆی (صبح ازل) جێگەی بگرێتەوە، بەلاّم (بهاء الله) کەسی دیار و خاوەن

پێگەی فراوان بووە، بۆیە یەکسەر دوای مردنی کەسی یەکەمی بزوتنەوەکە، خۆی وەکو جێگرەوەی ناساندووە، ئەمەش وای کرد، بەشی هەرە زۆری (البابیة)کان بچنە پاڵی، لێرەوە ناوی بزوتنەوەکە گۆڕانی بەسەردا هاتووە بۆ (البهائیة).

ئەگەرچی ئەم لقەی بزوتنەوەکەش لە زۆربەی بوارەکاندا، هەڵگری هەمان ڕێچکە بوونە، وەلێ گۆڕانی زۆریش لەتێڕامان و بۆچوونەکانیاندا دروستبووبوو، تا ئەو ئەندازەیەی ئەمەی دواییان پێگەی خۆی لە پێگەی پەیامبەران بەرزتر زانیوە، بەمەبەستی زیاتر خۆناساندن و گەیاندنی پەیام و بۆچوونەکانیان بەگەلانی ناوچەکە، چەندین گەشت و سەردانیان بۆ وڵاتانی ناوچەکە وەکو عێراق و سوریا و فەڵەستین ئەنجامدا، لەم گەشتانەیاندا بانگەشەیان بۆ ئاینێکی نوێ دەکرد و بەڕەهایی ئایینی ئیسلامیان ڕەتدەکردەوە، پێیان وابوو ئەم ئایینە نوێیە، ئایینێکی جیهانییە و هەموو ئایین و ڕێباز و باوەڕەکان لە خۆ دەگرێت.

دوای ئەم بانگەشە و گۆڕانانە، ئەوە بڵاودەکاتەوە لەئاسمانەوە کتێبێکی پیرۆزی بۆ هاتۆتە خوارەوە بە ناوی (الاقدس) هەروەها ئەوەی بڵاوکردەوە دوای دابەزینی ئەم کتێبە، ئیدی هەموو کتێبە ئاسمانیەکانی تر نەسخ بونەتەوە و نابێت کاریان پێی بکرێت. لەگەڵ هەموو ئەم گۆڕانانەدا تا هاتووە ململانێ و ناکۆکی نێوان (صبح ازل) و(بهاء الله) زیاتر بووە، بۆیە دەسەلأتدارانی عوسمانی هەڵساون بەدورخستنەوەی (میرزا یحیی نور) بۆ قوبرس و هەروەها

(میرزا حسین علی المازندرانی)یش بۆ شاری (عکا) لەفەڵەستین، ئەم ڕووداوەش لەساڵی (١٨٦٨)بووە، بەڵام ئەم کارەش وای نەکرد بە تەواوەتی ناوبراو لە هەوادارنی دوور بکەوێتەوە، تاکو لەساڵی (١٨٩٢) کۆچی دوایی دەکات و ئینجا کوڕەکەی بەناوی (عباس) کە نازناوی (عبدالبهاء)ی هەڵگرتبو جێگای دەگرێتەوە.

زۆر لە سەرچاوەکان قسە لەسەر ئەوە دەکەن، گوایە جۆریك پەیوەندی لە نێوان بەهائی و ماسۆنیدا هەبووە، بە تایبەتی لە بیستەکانی سەدەی بیستەمدا زۆر هاوکار بوونە و هەر ئەمانیش یەکێك بوونە لەو هێز و لایەنانە کە بانگەشەکار بوونە بۆ دامەزراندنی دەوڵەت و نیشتمانێك بۆ جوولەکە لە سەر خاکی فەڵەستین و بەهەنگاوێکی ڕەوایان زانیوە، ئەمەش لە لاپەڕە (١١٨)ی کتێبی (الاقدس)دا بە ڕوونی هاتووە.

ئێستا ناوەندی گەورەی کۆبونەوەی ئەم بزوتنەوەیە، دوای ئێران وئیسرائیل ولآتە یەککگرتووەکانی ئەمریکایە، گەورەترین مەحفەلەکانی بەهائییەی تێدایە، هەروەها لە (٢٦١) ولآت مەحفەلیان هەیە، هەرچی ژمارەی ئەندام و لایەنگرانی ئەم بزوتنەوەیە هەیە، ئەوە ئامارێکی گشتیمان لەبەر دەستدا نییە و ئەوەی زانراوە تەنها لەئێران (٣) ملیۆن ئەندامیان هەیە، ئەوەی ماوەتەوە بیلێین بەشێك لەکار و ڕەفتار و سیاسەتەکانی ئەم بزوتنەوەیە بەنهێنی دەچێتە ڕێوە، لەم خەسڵەتەشدا لەگەڵ باقی ڕێکخراوە نهێنیەکانی تری مێژوودا یەك دەگرنەوە.

زۆرێك لە نوسەر و چاودێران، لەكۆمەڵێك بابەتدا پێیان وایە جۆرێك لە هاوشێوەبوون و نزیكایەتی لەنێوان هەردوو كۆمەڵەی (البابية /البهائية) و(الماسونية) هەیە، بەتایبەتی لە:

- بابیەكان پێیان وایە زۆربەی فەیلەسوفە یۆنانییەكان لەفەلسەفەی بەنی ئیسرائیلەوە فێری فەلسەفە و مەعریفە بوونە.
- هەوڵدانی (عبدالبهاء) بۆ ئەنجامدانی گۆڕانكاری لەئایینە ئاسمانییەكاندا، تاكو ئایینی مەسیحی و ئیسلام و یەهودییەت یەك بخات.
- باوەڕهێنانیان بەوەی ڕۆژێك دێت، یەكێك لە نەوەكانی (داود) حكومڕانی هەموو جیهان دەكات.
- نیشتەجێبوونی (البهاء) لەشاری عەككا و پێشوازیكردنی لەجوولەكەكان.
- بانگەشەكردن بۆ وێرانكردنی شوێنە پیرۆزەكانی وەك مزگەوتەكان، بەتایبەتی كەعبە و (بيت المقدس).
- هاندانی جوولەكە بۆ نیشتەجێبوون لە فەڵەستین.
- پێیان وایە قودس بەدەستی مەسیحیی و موسڵمانان سوكایەتی پێكراوە، بۆیە پیرۆزی و بێگەردی بۆ ناگەڕێتەوە، تەنها بە هاتنەوەی جوولەكە نەبێت بۆ سەر ئەم خاكە.
- هێرشكردنە سەر ئایینەكانی تر لەقازانجی جوولەكە.

- بەئەندامبوونی زۆرترین ژمارە لەجولەکەکان لەڕیزی ئەم بزوتنەوەیەدا.
- پێشبینیکردنیان بۆ دروستبوونی دەوڵەتی جوولەکە لەساڵی (١٩٥٧).

هەروەها باس لەوەش دەکرێت، ڕێککەوتنێك لە نێوان (بهاء الله) و ماسۆنییەکاندا هەبووە بۆ دژایەتیکردنی ڕاستەوخۆی ئایینی ئیسلام.

# سوارەکانی هەیکەل (فرسان الهیکل)

ئەم ڕێکخراوە مۆرکێکی ئەورووپی و خاچدروشمی هەبووە، کاتێك ساڵی (١١١٨) ناوچە پیرۆزەکان دەکەونە بەر پەلامار و پرۆسەی داگیرکاری خاچدروشمانەوە، نۆ کەس لە سوارە دیارەکانی تایبەت بەچاودێریکردنی حاجیانی خاکی پیرۆز، کۆدەبنەوە بەمەبەستی دروستکردنی ڕێکخراوی سواران، دواتر دەبنە یەکێك لە ڕێکخراوە بەهێز و دیارەکانی ئەو سەردەمە، کە لەئەورووپادا وێنەی کەم بووە، لە سەر سرووشت و ڕەگ و ڕیشە ئەم ڕێکخراوە بیروبۆچوونی جیاواز هەیە، بێگومان ئامانجی سەرەکییان بابەتی حەماس و پشتگیریکردن بووە لەناو و ناوبانگ و ژیانی مەسیحییەت، کە هەردوو بواری سوارچاکی و بڕوایان کردبووە کاری بنچینەییان بۆ دژایەتیکردنی عەرەب و موسڵمانان، چوونکە دواجار ئەمان هێزێکی کاریگەری نێو خاچدروشمەکان بوونە و لەدژایەتیکردنی بەرانبەردا تۆخ و توند بوونە، ئەم گروپە مەریەمی پاکیزە(مریم العذراء)یان بەپیرۆز و ڕێبەری ڕوحی خۆیان زانیوە، هەروەها پێکەوە ڕاکۆك بوونە لەسەر ئەوەی بەپێی یاساکانی (قدیس ئۆگستین) بژین و کاربکەن، پاشان (هج دی باینز)یان وەکو یەکەم فەرمانذەی خۆیان هەڵبژارد.

دواتر پادشا (بالدوینی دووەم) هاوکاریان دەکات و بەشێك لەکۆشکەکەی خۆی بۆیان تەرخان دەکات، سەرباری پێشکەشکردنی هاوکاری مادیی و مەعنەویی، دوای ئەم هەموو پالپشتی و کۆمەکە ئیدی سوێند دەخۆن، پارێزەری نهێنییەکانی باوەڕی مەسیحییەت بن و هەروەها نەهێلن یەك بست خاکی خۆیان لەبەر دەستی دوژمندا بهێلنەوە. بەشێکی زۆر لەشارەزایان پێیان وایە دامەزراندنی ئەم گرووپە لەئاکامی بیرۆکەی ئەو سەربازانەوە هاتووە، کە بەکاری چاودێریکردنی حاجییە کاسۆلیکەکانی فەلەستین هەلدەستان، هەندێکیش پێیان وابووە ناوی ئەم گرووپە لەناوی ڕێکخراوێکی ترەوە وەرگیراوە وەك مێژوو باسی لێوە دەکات سەرەتا ئەم گرووپە دەست کورت و هەژار بوونە، وەلێ دوای پشتگیری و هاوکاری بێ سنووری پادشا، دوای یەك سالْ دەبنە خاوەنی هێز و لایەنگری زۆر.

پاش (٩) سالْ لەدامەزراندنی ئەم ڕێکخراوە و بردنە سەری ژیانێکی ئاسایی، دواتر دەبنە خاوەن ئالأیەکی تایبەت بە خۆیان، کە بریتیی بووە لەهەردوو ڕەنگی سپی و ڕەش و ناوەکەشی (beauseant) ئەم ناوەش بۆ یەکەم ئەسپی ئەم گرووپە دەگەڕایەوە، ئیدی ئەم وشەیە پاشتر بووە هێما و بانگەوازی شەڕ، دوای ماوەیەك لەخەبات و کار سەرانی ئەم ڕێکخراوە دەکەونە هەلپەی ئەوەی ڕەزامەندی خودی پاپا و گەورە ئوسقوفی و پیاوانی پلەبەرزی ئایینی وەربگرن و دانیان پێدا بنرێت وەك ڕێکخراوێکی پیرۆز و ڕەوا بناسرێن، وەك لەیەکێك لە ڕاسپاردەکانی سەرۆکی

دێرەکاندا هاتووە بەم شێوەیە ستایش کراون: (انهم لم یدخلوا الحرب مطأطي الرأس، وانما دخلوها متيقظين، هم مسالمون كأطفال حقيقيين لاسرائيل). زۆریك ئەم ڕاسپاردە و ستایشە دەکەنە بەڵگەیەك بۆ هەبوونی جۆریك لەپەیوەندی لە نێوان خاچدروشمان و جوولەکەدا، هەروەها پێیان وایە ئەمە باشترین بەڵگەیە بۆ بوونی پەیوەندی جوولەکە بەم ڕێکخراوەوە.

ئەندامانی ئەم ڕێکخراوە بەسوارچاك و سەرکێش و ئازا ناسرابوون، ئەوەش بیویستبایە ببێتە ئەندام دەبوایە لەگۆڕەپانی جەنگدا ئازایەتی خۆی بنواندبایە، پاش ئەوەی لەلایەن گەورە پیاوان و ئەسقەفیەکانەوە بەچاودێری پاپا دانیان پێدانرا، خودی پاپا هۆنوریوس جلی سپی ڕەنگیان بۆ هەڵدەبژێری، دواتریش بە فەرمانی (پاپا ئەجینیۆسی سێیەم) خاچی سور (الصليب الاحمر)یان بۆ هەڵبژاردن، ئەمەش لە ساڵی (١١٤٦)زاینی بووە.

هەرچی (هج باینن) بوو ڕێگەی پێدرا لایەنگر و ئەندام بۆ خۆیان لەهەر یەك لەفەڕەنسا و ئینگلتەڕا کۆ بکاتەوە، ئەمەش وای کرد بەبەردەوامی دیاری و پاداشتی زۆر بۆ ئەم ڕێکخراوە ڕەوانە بکرێت، سەرباری هاتنی چەك و پێداویستی تر لەهەموو دەڤەرەکانی ترەوە، ئەم هەموو هاوکاری و پاڵپشتییە وای کرد ئەم ڕێکخراوە بایەخی زیاتری پێی بدرێت و سەنگ و قورسایی زێدەتر بێت، بۆ نموونە (ریتشاردی یەکەم) پادشای ئینگلتەڕا یەکێك بووە لەوانەی زۆر لەژێر کاریگەری ئەم ڕێکخراوەدا بووە.

بیرورِایەکی واش هەیە سوارەکانی هەیکەل بە هاوپەیمانێتی لەگەڵ (الحشاشین)دا بوونە بەشێك لە شاڵاوی خاچدروشمان بۆ داگیرکردنی (دیمەشق) دیارە لەسەر ئەم هاوپەیمانێتییە ڕای جیاواز هەیە، بۆ نموونە ڕۆژهەڵاتناس (فون هامر) پێی وابووە هاوشێوە بونێك لەنێوان هەردوو ڕێکخراودا هەبووە، هەروەها پێی وابووە پەیوەندی لەنێوان لایەنگرانی حەسەن سەباح و سوارەکانی هەیکەلدا هەبووە، چوونکە هەردوو ڕێکخراو یەك شێوازی ڕێکخراوەییان هەبووە، هەرچی خاوەنی کتێبی (تأریخ الجماعات السرية) یە جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە، ئەم دوو ڕێکخراوە تەواوکاری یەکن، هەرچەندە بەشێك لەمێژوونوسانی ڕۆژئاوا لەسەر بوونی ئەم پەیوەندییە ناکۆك و دژن.

بەهەرحاڵ شك و گومانی زۆر هەیە لەسەر ئاست و جۆری ئەم پەیوەندییە، هەروەها گومانیش لەخودی سوارەکانیش هەیە و گوایە بەشداریکردنیان لەجەنگی خاچدروشماندا تەنها بۆ ئامانج و مەبەستی تایبەت خۆیان بووە، چوونکە ئەندامانی ئەم ڕێکخراوە ئەوەندە ئینتیما و پەیوەستبوونیان بەکەسی یەکەمی ڕێکخراوەکەوە بووە، کەمتر ئینتیمایان بووە بۆ ئایین و ئەگەر شتێکیش هەبووبێت لە ئاستی پێویستدا نەبووە، یەکێك لەو تۆمەتانەش دەخرێتە پاڵیان ئەوەیە گوایە وەکو پێویست بایەخیان بە ئایین نەداوە، وەلێ پتر سەرقاڵی کۆکردنەوەی زێڕ و ئاڵتون و تاڵانی بوونە.

دوای تێکشکانی خاچدروشمان، ژمارەیەك مەسیحیی و سوارەکانی هەیکەل لەسەر خاکی پیرۆز مانەوە و هەموو دەستکەوت و سامانێکیان لەدەستدا، دواتریش هێزی سەرەکییان کەوتە ئەورووپاوە، بەتایبەتی لە فەرەنسا و ئینگلتەرا، دیارە دوای لەدەستدانی قودس، ناوەندی کارەکانیان دەگوازنەوە بۆ ئەورووپا. کاتێکیش ئەم ڕێکخراوە دەگاتە لوتکە و فراوان بوون، لە نێو خۆیاندا بەم شێوەیە ڕیزەکانیان پۆلین دەکەن:

- الفرسان الرؤساء
- الرهبان المرشدون
- الاخوة الخادمون

هەرچی مەرجەکانی بوون بەئەندامە لەم ڕێکخراوەدا بریتیی بوونە لە:

١- دەبێت لە خێزانێکی دیار بێت.
٢- کەسێکی نموونەیی بێت، بۆ نموونە باوکی سوار بێت.
٣- لە ئەنجامی هاوسەرگیرییەکی یاسایی و شەرعییەوە لەدایك بووبێت.
٤- کەسی پاڵێوراو بۆ ئەندامێتی ئەم ڕێکخراوە، دەبێت سەڵت بێت واتا خێزانی پێکەوە نەنابێت یان هیچ جۆرە پەیوەست بوونێکی نەبێت.
٥- کەسی پاڵێوراو نابێت ئەندام بێت لە هیچ ڕێکخراوێکی تردا.

٦- کەسی پاڵێوراو نابێت قەرزاری کەس بێت.

لە دوای ماوەیەکیش کەسی پاڵێوراو تا تەمەنی نەگەیشتبایە(٢١) ساڵ لەو ڕێکخراوەدا بە ئەندام وەرنەدەگیرا، بۆ وەرگرتنی هەر ئەندامێکی نوێش ئاهەنگێکی تایبەت لەکەنیسەدا ڕێکدەخرا، لە کاتی ڕێوڕەسمی وەرگرتنی ئەندامدا، کەسی گەورەی ئەم ڕێکخراوە بەم شێوەیە کۆبونەوەکەی دەست پێدەکرد: (اخوتنا الاحباء، انتم ترون ان الغالبية وافقت على قبول هذا الرجل كأخ لنا، فلو كان بينكم واحد يعرف عنة شيئا يمكن ان يمنعة قانونيا من ان يصبح اخا، علية ان يقولة، لانة من الافضل تحديد هذا سلفا قبل ان يحضر امامنا).

ئەم دەقەی سەرەوە ئاماژەیەکە بۆ ئەو ڕاستییە، وەرگرتنی ئەندامی نوێ کارێکی ڕۆتین و ئاسان نەبووە، بەڵکو دەبوایە بەفیلتەری کۆبوونەوەیەکی گرنگدا گوزەری بکردبایە و زۆرترین ڕای ئەندامانیش بۆ ئەم حاڵەتە وەربگیرابایە، تاکو کەسێك وەك ئەندام و برا (اخ) وەربگیرێت، دوای وەرگرتنی ڕەزامەندیش لەسەر ئەندام، دەبوایە ئەو کەسە لەگەڵ دوو یان سێ سواری شارەزادا ببرایەتە ژوورێکی ترەوە تاکو هەندێك ڕێنوێنی و ئامۆژگاری تایبەت بکرابایە، پاش بڕینی ئەم قۆناغەش دەبرایە ئەنجومەنی کەنیسە (المجلس الكنيسي) و دەبوایە ئەم چەند ڕستەیەی بوتبایە (سيدي، امام الله وامامك، لاجل الرب وسيدتنا المبجلة ان تقبلني كواحد سيبقى طول حياته خادما وعبدا للجماعة).

دوای ئەوەی سوێندی بەخوا و مەریەمی پاکیزە و بەهەیکەل دەخوارد، ئیدی وەکو ئەندامێکی فەرمی وەردەگیراو کۆمەڵێك ڕێنمایی و ئامۆژگاریی بۆ ئاشکرا دەکرا و بەتەواوەتی لەڕیزی ڕێکخراوی (الفرسان الهیکل) وەردەگیرا.

# کۆمەڵە نهێنییەکانی تر

قسەکردن لەسەر ڕێکخراو و کۆمەڵە نهێنییەکان لە مێژوودا، بەتەنها ئەوە دێنێت کتێبێکی قەبارە گەورەی لەسەر بنوسرێت یان زیاتریش، بێگومان لەم لێکۆڵینەوەیەدا بەدرێژی و جیاجیا قسەکردن لەسەر هەریەك لەو ڕێکخراوانە، ڕەنگە کارێکی سانا نەبێت و دەکرێت لەکات و شوێنی تردا لەسەری بدوێین و بیخەینە بەر لێکۆڵینەوە.

دیارە هێنانەوەی چەند نموونەیەکیش وەك پێشتر ئاماژەمان بۆی کرد، تەنها لەبەر ئەوەیە تا ئەندازەیەك وێنەیەکی ڕوونمان لادروست بێت لەمەڕ فەزای ئەو بزوتنەوە و کۆمەڵە نهێنییانەی مێژووی مرۆڤایەتی بە خۆیەوە بینیویەتی، تاوەکو ببێتە دەروازەیەك بۆ ڕووچوونە نێو بابەتی ماسۆنیزمەوە، بێشك ژمارەی ئەم جۆرە کۆمەڵانە زۆر لەوە زیاترن کە ئێمە قسەمان لەسەری کرد چوونکە چەندین ڕێکخراوی دیکە هەن هاوشێوەی ئەوانەن کە باسیان لێوە کرا لەنموونەی:

- الغاردونا محاربو اسبانية المقدسون.
- جماعة الصليب الوردي.
- الفحامون.
- احباب الملاك الحارس.

● الخصاءون في روسيا.

ئاشكرایه وەك زێدەرەكان باسی لێوە دەكەن، لەچەندین ڕووەوە بەتایبەتی لەڕووی ئامانج و شێوازی كاری نهێنیی و مەرجەكانی ئەندام بوون و سوێند خواردن...هتاد، جۆریك لەهاوشێوەبوون هەیە لەنێوان ماسۆنییەت و هەر یەك لەم ڕێكخراوانەی باس كران.

ئەگەرچی هەندێك لە نوسەر و ڕووناكبیرانی عەرەب، بەشی زۆری ئەم ڕێكخراوانە بە تەواوكەری یەكتر و دروستكراوی جولەكە دەزانن، وەلێ لەڕواڵەت و نێوەڕۆكیشدا مەرج نییە ئەو بۆچوونە وابێت، چوونكە جیاوازی زۆر بە دیی دەكرێت لەكات و شێوازی سەرهەڵدان و بەشێك لەتایبەتمەندیەكانی هەر یەك لەو ڕێكخراوانە، وەك دەبینرێت هەندێكیان لەنێو دونیای ئایینزای جولەكەوە سەریان هەڵداوە، لە بەرانبەردا هەشە لەنێو ڕێباز و باوەڕ و ئایینزای ئیسلام و مەسیحییەوە چەكەرەی كردووە، بۆیە سەرباری بوونی خاڵی هاوبەش لەنێوان هەندێك لەو كۆمەڵە و ڕێكخراوانەدا، ناكرێت هەموویان بە تەواوكەری یەكتر و بەیەك پێوەر تەماشا بكەین، ڕەنگە لەدامەزراندن و هەندێك بەرنامە و بۆچووندا لەیەكدی سوودیان وەرگرتبێت، هەموو ئەمەش پێكەوەر ئەوە ناگەیەنێت تەواوكەری یەكتر بن، یان هەموویان بەرهەمی یەك سەرچاوە بن.

# ڕەگ و ڕیشەی ماسۆنییەت

پێم وایە لە بەر چەندین فاکتەر، کارێکی فرە سانا نییە قسە لەسەر ڕەهەندە جیاجیاکانی ماسۆنییەت بکەین، بەتایبەتی مشت و مڕ و تیر و توانجی نوسەرە عەرەبەکان پتر دۆخەکەیان ئاڵۆزکردووە، لە ڕاستیدا کارێکی پڕ زەحمەتە بۆ هەر لێکۆڵەرێك وا بەسانایی بتوانێت خۆی لەقەرەی وەها بابەتێك بدات، چوونکە دووچاری چەندین گێچەڵی سۆزداری نێو کۆمەڵگە و هەروەها ڕووبەڕووی گرفتی زانستیش دەبێتەوە.

ئەو سەرچاوانەی کە هەنووکە لەبەردەستدان دوور نەبوونە لەکاری شێواندن و بۆچوونی دژ و ئاڵۆزیکی، بەدەگمەن دەبینرێت کتێبێك یان لیکۆڵینەوەیەك ڕووناکبیرێکی عەرەب نوسیبێتی و بێلایەن بێت و دوور بێت لەکاری شێواندن و ناشیرینکردن، تەنانەت ئەوەندە ئەم بزوتنەوەیە قەبە کراوەتەوە، یان ئەوەندە بەمەترسی پیشانی خوێنەر دراوە، هەمیشە ڕوانینی تاك و کۆی کۆمەڵگەی ئیسلامی بەگشتی و کۆمەڵگەی عەرەبی بەتایبەتی وەکو دێوەزمەیەك تەماشای ماسۆنییەت کراوە یان دەکەن، هەموو ئەم ڕاستیانە گفتوگۆ و لێدوانی لەسەر ئەم کۆمەڵەیە پڕ زەحمەت کردووە و هەندێك جاریش وەکو مۆتەکە و بڤە نیشان دراوە، زۆرجار تاوان و کارەسات و کاولکاری و زۆربەی گۆڕان و ڕووداوە

جیهانییەکان خراونەتە ئەستۆی ئەم ڕێکخراوە، وەك ئەوەی سەرچاوەی هەموو دەردەسەری و کاولکارییەکانی مرۆڤایەتی بێت بەدرێژایی مێژوو.

ئەز ناتوانم بڵێم ئەم بۆچوونە دروستە یان نا، چوونکە وای دەبینم زیاد لەپێویست ئەم ڕێکخراوە گەورەکراوە، لەبەر سروشتی پڕ لەنهێنی ئەم کۆمەڵەیە ئەوەندە بەڵگە لەبەر دەستدا نین، بۆ سەلماندنی هەر هەموو ئەو تۆمەت و تاوانانەی کە خراونەتە ئەستۆی. لێرەوە بەدیاریکراوی لەسەر یەکە بەیەکەی تایبەتمەندییەکانی بزوتنەوەی ماسۆنیزم قسە دەکەین، بەو ئومێدەی لە کلاوڕۆژنەی تایبەتمەندیەکانییەوە بتوانین وێنەیەکی ڕوون یان هەر هیچ نەبێت پێناسەیەکی **گشتگیر** لەسەر ئەم کۆمەڵەیە بەخوێنەری کورد بگەیەنین.

# ماسۆنییەت وەکو زاراوە

سەرجەم ژێدەر و سەرچاوەکان کە لەبەر دەستدان، کۆکن لەسەر ئەوەی دەستەواژەی (free masonry) ناوێکی ئاوێتەیە و لەدوو وشە پێکهاتووە، وشەی فری (free) بە مانای ئازاد یان ڕاستگۆ دێت، وشەی ماسۆنییە(masonry) مانای (البناء) دێت، کەواتا هەردوو وشەکە پێکەوە بەمانای بنیاتنەری ڕاستگۆ، یان بنیاتنەرانی ئازادبەخش دێت، بۆیە هەندێکجار بە (الماسونية الحرة) ناسراوە، هەروەها سەبارەت بەواژەی ماسۆنییەت، یان بە (فرمسون) لەکتێبی (السر المصون)دا هاتووە: (فرمسون) ناوێکی ئاوێتەیە لەهەردوو دەستەواژەی (الفرنسيتين) فران(franc) بە مانای ڕاستگۆ و وشەی (ماسون)یشە بە مانای بنیاتنەر، کەواتا هەردوو وشەکە پێکەوە بەمانای بنیاتنەرانی ڕاستگۆ دێت.

# پێناسەی ماسۆنییەت

مشتومڕێکی زۆر هەیە لەسەر دەستنیشانکردنی پێناسەیەکی دروست و تەواو، گەلەك زێدەر و لێکۆڵینەوە لەبەر دەستدان و سانا نییە هەموویان پشتیان پێی ببەسترێت، لەکاتی شەنو کەوکردنیاندا هەست دەکرێت بێ لایەن نەبوونە و هەندێکیان ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەخۆ بەمیتۆدێکی زانستیانە مامەڵەیان لەتەك ئەم دەستەواژەیە یان بابەتەکانی پەیوەست بەم بزوتنەوەیەوە نەکردووە، چوونکە سەرچاوەکان بەشی زۆریان عەرەبین، وەك پێشتریش ئاماژەمان بۆی کرد عەرەب بە بەردەوامی ماسۆنییەتی بەدوژمنی خۆی و ئایینی ئیسلام زانیوە، هەمیشە وەکو هەڕەشە سەرنجی داوە بۆ سەر خاك و نیشتمان و چارەنوسیان، جا زۆر ڕوون نییە تا چ ئەندازەیەك ئەم بۆچوونە ڕاست و دروستن.

بەهەرحاڵ باشتر وایە سەرەتا بیرو بۆچوونی کۆمەڵێك توێژەر بخەینە بەردیدە لەمەڕ پێناسەکردنی دەستەواژەی ماسۆنییەت، ئینجا دەکرێت سەرنج و تێڕوانینی خۆمانیشی بخەینە سەر:

- لەم بارەوە (الاب لویس شیخو) چەندین پێناسە یان بۆچوونی جیاجیای خستۆتە ڕوو، کەلای خۆیشی دروسترین پێناسە ئەوەیە کە دەڵێت: (ماسۆنییەت بەرهەمی کۆمەڵە و

گرووپە نهێنییەکانە، کە لەسەرەتاکانی سەرهەڵدانی نەسرانیەتەوە لەدایك بوونە، بەمەبەستی کێبڕکێ و دژایەتیکردنی ئایینی مەسیحییەتە ).

- لە کتێبی (خطر اليهودية العالمية على الاسلام والمسيحية) کە ئەویش لە(اسحاق واين)وە لەژمارە (٣)ی ساڵی(١٨٦٦)ی گۆڤاری (Israalite of america)وە وەریگرتووە، سەبارەت بە پێناسەی ماسۆنییەت دەڵێت: (ماسۆنییەت دەزگایەکی جولەکەیە بە مێژوو و پلە و وشە و نهێنییەکانیەوە، بە هەموو ئاماژەکانەوە لەسەرەتاوە تا کۆتایی هی جولەکەیە).

- لە شوێنێکی تردا ئەم زاراوەیە وا پێناسە کراوە: (ماسۆنییەت بەواتای بنیاتنەری ڕاستگۆ، کۆمەڵەی ماسۆنییەت بە مانای بنیاتنەرانی ڕاستگۆ یان بنیاتنەرانی ڕزگاربەخش، ناوی (بنیاتنەری ڕزگاربەخش) لەسەدەی سێزدەوە سەری هەڵداوە وەك ئاماژەیەك بۆ ئەو کرێکارانەی کە بینایان بەبەرد دروست دەکرد. هەروەها لە هەمان سەرچاوەدا بەم شێوەیەی لای خوارەوە پێناسەی ماسۆنییەت کراوە: (ماسۆنییەت ڕێکخراوێکی نێودەوڵەتییە، بە ناوی (بنیاتنەرانی ڕزگاربەخش) ناسراوە و خاوەنی کۆمەڵێك ئامانج و دروشمە، هەندێکی ئاشکرایە و زانراوە و هەندێکیشی تا هەنوکە بڵاونەکراوەتەوە، بەڵکو بە پەنهانی و نهێنی ماوەتەوە، تەنها بۆ ئەندامە تایبەتەکانیان نەبێت).

● هەرچی (عبدالمجید همو)یە بەشێوەیەکی نەرێنی قسەی لە سەر دەکات و بەم شێوەیە پێناسەی ئەم ڕێکخراوە دەکات و دەڵێت: (ماسۆنییەت بزاڤێکی نهێنییە لەنێو چینە بۆرجوازییەکاندا بڵاودەبێتەوە, هەوڵ دەدات دەسەڵاتی خۆی بەسەر ڕەنجبەران بەهێز بکات, شێوازی دەسیسەو پیلانگێڕی لەدژی میللەتان بەکاردێنێ). ئەم لیکۆڵەرە عەرەبە پێی وایە ئەم بزوتنەوەیە ئەوپەڕی نهێنیە و پتر لەنێو چینی بۆرژوازیدا گەشە دەکات و کار بۆ چەوساندنەوەی ڕەنجبەران دەکات، هەروەها لەڕێگای دەسیسە و پیلانەوە دەخوازێت کۆنترۆڵی گەلان بکات.

● هەر لە چوارچێوەی پێناسەکانی ئەم ڕێکخراوەدا هاتووە: (ماسۆنییەت بزوتنەوەیەکی جیهانی و ڕێکخراوێکی نێودەوڵەتییە، لە سەدەکانی ناوەڕاستدا لە ئەوروپا سەریهەڵداوە، جیاوازی زۆر هەیە لەنێوان دروشمە ڕاگەیاندرا و ئامانج و نهێنیە شاراوەکانیاندا ).

لەم چەند پێناسەیەی سەرەوەدا، کۆمەڵێك بۆچوون [illegible] لەمەڕ پێناسەکردنی ماسۆنییەت کە بەزۆری لە لایەن [illegible] ماسۆنییزمەوە داتاشراوە و مەرج نییە سەت دەر سەت [illegible] لای خۆمانەوە دوای خوێندنەوەی خەسڵەت و [illegible]ەکانی ماسۆنییەت دەکرێت بەم چەشنە پێناسەی بکەین: (ماسۆنییەت جولانەوەیەکی شاراوە و کۆنە، بەچەندین قۆناغی خۆ

نوێکردنەوەدا گوزەری کردووە، کە زیاتر مۆرکی جولەکەی پێوە دیارە و بە شێوە نهێنییەکەی بووەتە ڕێکخراوێکی جیهانی گەورەی کاریگەر.

دەکرێت لانی کەم ڕەگەزەکانی پێناسەی ماسۆنییەت بەم چەشنە دیاری بکەین:

- ڕێکخراوێکی مێژوویی کۆنە و بە چەندین قۆناغ دا گوزەری کردووە.
- ڕێکخراوێکی شاراوەیە و بەشی زۆری ئامانج و دروشمەکانی نهێنین.
- ڕێکخراوێکی جیهانی گەورەیە و لە زۆربەی وڵاتانی دونیادا مەحفەل و ئەندامیان هەیە.
- ڕێکخراوێکە پتر مۆرکی جولەکەی پێوە دیارە، ئەگەرچی ئەمڕۆ بەملیۆنان ئەندامی هەیە لەنەتەوە و ئایینە جیا جیاکانی دونیا، تەنانەت تێیاندایە خاوەن پلەو پایەی دیارن.

# مێژووی کۆنی ماسۆنیزم

زۆریك لە خەسڵەت و تایبەتمەندییەکانی ماسۆنیزم، لای توێژەر و شارەزایان جێگای هەڵوێست لەسەر کردنە و مشتومڕی زۆریشی لێ کەوتووەتەوە، ژینگە و کات و شوێن و مێژووی سەرهەڵدانی ئەم ڕێکخراوە پانتایەکی زۆری لە تێکڕای مێژووی ئەم ڕێکخراوە دروست کردووە.

بێگومان ئەم دۆخەش تەنها لە لایەن بەرەی دژەوە دروست نەبووە، بەڵکو خودی ڕێبەر و لایەنگر و کەسە دیارەکانی ماسۆنییەتیش لە سەر دەستنیشانکردنی ئەم مێژووە ناکۆکن و جیاوازی زۆر بەدی دەکرێ، بەتایبەتی لەسەر ڕەگ و ڕیشە سەرەتایەکانی ئەم بزوتنەوەیە، ئەوەش لەم بوارەدا دێنی دیقەت بدرێت ئاستی ناکۆکی خودی ماسۆنییەکان سەبارەت بەم بابەتە، هەرگیز نەیانتوانیوە لەسەر یەك ڕای یەککگرتوو کۆك و تەبابن لە مەڕ دەستنیشانکردنی سات و کات و مێژووی تەواوی سەرهەڵدانی کۆمەڵەی ماسۆنییەت.

باش وایە گەشتێك بەنێو بیروڕا جیاوازەکانی خودی ڕێبەر و مامۆستایانی ئەم کۆمەڵەیەدا لە لایەك و بەرەی نەیارانیش لە لایەکی ترەوە بکەین، سەبارەت مێژووی سەرهەڵدانی ماسۆنییەت، ئینجا

ڕای خۆمانیش لەم بارەوە بخەینە ڕوو، تاکو بتوانین دیدێکی گشتگیر و دروست بخەینە بەر دەستی خوێنەر، هەرچەند زۆریك لە مێژوونوسانی ماسۆنییەت بەتایبەت لە سەدەی هەژدەدا پێیان وابووە گەڕان و پشکنین بەدوای دیاریکردنی ڕەگ و ڕیشەی ماسۆنییەت دا کارێکی پڕ زەحمەتە و ڕەنگە کۆدەنگی دروست نەبێت سەبارەت بەم مەسەلەیە، هەر بۆیە بۆ پشت ڕاستکردنەوەی ئەم بۆچوونەی سەرەوە دەکرێ گەشتێك بەنێو بیروبۆچوونی شارەزایانی ئەم بوارەدا بکەین، بەمەبەستی گەیشتن بەئەنجامێك تا ئەندازەیەك لۆژیکی و بنەمادار بێت، هەرچەندە بیرۆکەیەکی واش هەیە جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە ڕیشەی ماسۆنییەت بۆ تەنها سەرچاوەیەك ناگەڕێتەوە، بەڵکو بەرهەمی کۆمەڵێك تیۆر و سەرچاوەیە، بەنموونە کەسێکی وەك (الجنرال جواد رفعت اتلخان) لە کتێبەکەیدا بەناوی (اسرار الماسونية)دا، دەڵێ تا ئێستاش شوێنی سەرهەڵدانی ئەم ڕێکخراوە نادیارە و ئامانجی هەرە سەرەکیشی تا هەنوکە بەنهێنی ماوەتەوە، تەنانەت لای ئەندامەکانیشی هەر وایە، لە درێژەی بۆچوونەکانیدا سەبارەت بەڕەگە مێژووییەکەی ئەم ڕێکخراوە، دەڵێت چەندین تیۆری جیا جیا باسکراون وەك:

- البطارقة
- اسرار الوثنيين
- معبد سليمان
- الصليبيون

- فرسان الصليب الوردي
- جماعة الصناعات الرومانية
- عمال البناء في العصور الوسطى
- اخوة الصليب الوردي
- اوليفر كرومويل والبيورتيانيون
- الامير جارس سيتورات
- السيد كريستوفر
- ديزا جليية واصدقاؤة.

له لایەکی تریشەوە هەندێك تیۆر و بۆچوونی دیکە لەم بارەوە هەیە و لە چەندین لاوە خراونەتە بەر شرۆڤە، وەڵێ بە پشت بەستن بە ئەفسانەکانی تەورات، یەکەم مرۆڤی سەر زەوی ئادەم بووە و بەم پێیەش بێت کەواتا یەکەم کەسی ماسۆنی خودی ئادەم بووە، یان [illegible] وەك (درایت) جەخت لە سەر ئەوە دەکاتەوە هەموو [illegible]ەکانی ماسۆنییەت زانراو بووە لای پەیامبەرانی وەکو موسا و ئیبراهیم و یەعقوب، ڕای واش هەیە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات خوای گەورە لە بەهەشت دا ماسۆنییەتی دروست کردووە و خودی [illegible] یەکەم مەحفەل بووە، کە میکائیلی سەرۆکی فریشتەکان یەکەم مامۆستای مەزنی ئەو مەحفەلە بووە.

[illegible] (شاهین مکاریوس) ی خاوەنی گۆڤاری (اللطائف في [illegible] الاداب الماسونية) پێی وایە ماسۆنییەت بەچەندین قۆناغ دا تێپەڕیوە، گەلەك هەوراز و نشێوی بڕیوە تا گەیشتۆتە ئەم قۆناغەی

ئێستای، پێدەچێت سەرهەڵدانی ئەم کۆمەڵەیە بگەڕێتەوە بۆ (ڕۆما) و لەساڵی (١٧٥)ی پێش زایین سەری هەڵدابێت، هەروەها جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە ئەم شێوازەی ئێستای ماسۆنییەت، کاتی خۆی لە ڕۆمادا سەریهەڵداوە. ئاشکرایە (شاهین مکاریوس) کەسێکی دیاری نێو کۆمەڵەی ماسۆنیزم بووە، وەلێ دەبینین لەگەڵ زۆربەی بیروڕای ئەوانی تردا جیاواز بووە لەدیاریکردنی کات و شوێنی سەرهەڵدانی ئەم کۆمەڵەیەدا.

هەرچی (جرجی زیدان)ە، خاوەنی کتێبی (تأریخ الماسونیة) دەڵێت: مێژوونوسان لەسەر دیاریکردنی سەرهەڵدانی ئەم کۆمەڵەیە زۆر ناکۆکن، هەندێك پێیان وایە لوایە و پێش سەدەی هەژدە بوونی نەبووە، هەندێکی تریش مێژووەکەیان گەڕاندووەتەوە بۆ پێش ئەو مێژووە، کە ئەویش کۆمەڵەی (الصلیب الوردي)یە کە لە ساڵی (١٦١٦) زایینی دروست بووە، وتراویشە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی شەڕی خاچدروشمان، وتراویشە دەگەڕێتەوە بۆ یۆنان لەپێش زاییندا، کەسێکیش لەوانە وتویەتی لە (هیکل سلیمان)دا سەریهەڵداوە، کۆمەڵێکی تریش مێژووی ئەم ڕێکخراوە بە کۆنتر دەزانن و گەڕاندویانەتەوە بۆ کاهینەکانی میسری و هیندی و ئەوانی تر. یەکێك لە ماسۆنییە ئینگلیزەکان پێی وایە قەدیس (البان) ماسۆنییەتی لە بەریتانیا دروست کردووە، ئەویش لە ساڵی (٩٢٦) و لەلایەن پادشا (تسوغ)وە ڕێگەی پێدراوە کاری خۆیان بکەن و کۆبوونەوە نهێنییەکانیان لە شاری (یورك) ئەنجام بدەن، کە

مەحفەلی مەزنی ئینگلیزی تێدا دروستکرابوو. هەرچەندە (الاب لویس شیخو) ئەم بۆچوونە بەدرۆ دەخاتەوە و جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە ئەم (البان) ناوە لەو مێژوودا بوونی نەبووە.

لە شوێنێکی تردا هاتووە، ساڵی (٤٣)ی زایینی لەفەڵەستین وناوچەی (القدس — اورشلیم)دا پادشا (هیرودۆسی دووەم) کە نازناوی (ئەکریپا) یان (ئەغریپا)ی هەڵگرتبوو، ڕاوێژکارێکی جولەکەی هەبووە بە ناوی (حیران ابیود) کە ئێجگار دژ بە مەسیحییەت ودڵسۆزی ئایینی جولەکە بووە، کاتێك دەبینێت تا دێت لایەنگرانی ئەم ئایینە ڕوو لەزیاد بوونە، دەچێتە لای پادشا هیرۆدۆسی دووەم و پێشنیازی دامەزراندنی کۆمەڵەیەکی نهێنی بۆ دەکات کە ئامانجی بەرەنگاربوونەوەی پیاوانی ئایینی و لایەنگرانی مەسیحییەت بێت، زۆریش هانی پادشا دەدات تاکو هەرچی پارە و توانای هەیە بەکاربهێنێ بە مەبەستی پەکخستنی بڵاوبونەوەی ئایینی نەسرانی، پادشاش یەکسەر ڕەزامەندی خۆی لەسەر ئەم پێشنیارە دەردەبڕێت. دوای ئەوەش ئەم ڕێکخراوە بەتەواوەتی دروست دەبێت، دەکەوێتە هەڵپەی جێبەجێکردنی ئامانجەکانییەوە، لەم بارەوە ڕایەکی زۆر دروست هەیە، پێی وایە ئەم کۆمەڵەیە کە ناوی هێزی شاراوە (القوة الخفية) بووە، دواتر و لە قۆناغەکانی تردا ناوەکەی گۆڕدراوە بۆ ماسۆنییەت، ئەمەی دواییان درێژکراوەی هەمان هێزی شارەوەیە، کە ساڵی (٤٣)ی زایینی لە فەڵەستین دامەزراوە.

هەر بۆ زیاتر سەلماندنی ئەو ڕاستییەی کە پێی وایە بنەچەی ماسۆنیزم تەڵخ و نادیارە، تەنانەت خودی مێژوونوسانی ئەم کۆمەڵەیەش یەك ڕانین، دەکرێ هەندێك نموونەی دیکە بخەینە بەر دەست.

- (فیولیت) خاوەنی کتێبی (قرنین من الماسونیة) دەڵێت: مێژوونوسانی ماسۆنییەت لە سەدەی هەژدەدا دانیان بەوەدا ناوە، گەڕان و سۆراغ بەدوای زانینی مێژووی دروستبوونی ماسۆنییەتدا کارێکی قورس و گرانە.
- دوکتۆر (اندرسون) گەڕاوەتەوە بۆ سەردەمی کۆن و پێی وابووە ئەم بابەتە لە (ئادەم)ەوە دەست پێدەکات.
- هەرچی (الاخ بریستول)ە لە ساڵی (١٧٧٢) دەڵێت: جۆلیوس قەیسەر کە لەساڵی (٤٤)ی پێش مەسیح مردووە ماسۆنی بووە، هەروەها (الدرويد) ماسۆنی بووە کە وەزیری کاروباری ئایینی بووە لە سەردەمی (الغاليين)دا، کەواتا بەم پێیە بێت ماسۆنیزم دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمێکی ئێجگار دێرین.
- دوکتۆر (اولیفر) زۆر لەو بیروڕایانەی سەرەوە دوورتر دەڕوات و دەڵێت داب و نەریتەکانی ماسۆنییەت زۆر کۆنە، ئەم کۆمەڵەیە هەر هەبووە پێش ئەوەی هەسارەی زەوی دروست بێت چوونکە لە چینەکانی ئاسمان دا بڵاوبووبووەوە.

• هەروەها سەبارەت بە هەمان بابەت (الاخ ميتشال ...
لەو رايەی پێشو رۆيشتوە، بەڵكو لە ئەنجامی پشكنينەكانيدا
لەسەر دياريكردنی ڕەگ و ڕيشەی ماسۆنييەت، گەيشتوەتە
ئەو بڕوايەی بنەچەكەی دەگەڕێتەوە بۆ كاتی بنياتنانی (هەيكل
سلێمان).

• هەر لەم بارەوە دوكتۆر (محمد عمارة) پێی وايە
بزوتنەوەيەكی جيهانی و ڕێكخراوێكی نێودەوڵەتييە، لە
سەدەكانی ناوەڕاستدا و لە ئەورووپا سەری هەڵداوە.

هەروەها كۆمەڵێك بيرو ڕای تريش هەن پێيان وايە ئەم
كۆمەڵەيە لە نێو كلدانەكاندا سەری هەڵداوە، بيرو ڕايەكی ديكەش
هەيە جەخت لەسەر ئەوە دەكاتەوە، گوايە مێژووی سەرهەڵدانی
ماسۆنييەت دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٧١٧) ئەمەش كۆمەڵێك نوسەر
ئيشی لەسەر دەكەن و پێيان وايە ئەم مێژووە سەرەتايەكە بۆ
سەرهەڵدانی ماسۆنيزم بەم شێوازەی ئێستايەوە.

وەك ديقەتمان دا كەم لە سەرچاوەكان هاوتەريبن يان كۆكن
بۆ دەستنيشانكردنی يەك مێژوو، يان يەك سەردەمی ڕوون و ديار،
وەلێ جۆرێك دابەشبوون دروست بووە زۆربەی ديد و بۆچوونەكانيش
لە يەكترەوە دوورن و هەرگيز ناتوانرێت كۆدەنگييەكی كۆنكريتی
ئەوتۆ دروست بێت، بۆ دياری كردنی ئەم خاڵە، بەمەش ئالۆزييەك
لەمەڕ خاڵی لەدايكبوونی ئەم كۆمەڵەيە هاتووەتە گۆڕێ، بەندەش
وەك زۆرێك لەوانی دی بۆچوونەكان لەچەند سەرچاوەيەكدا كۆ

دەکەمەوە، کە دەکرێت دواتر و دوای پشکنینی زانستی و بابەتیانە ئیشیان لە سەر بکرێت، یان وردتر زۆری بۆچوون وناکۆکییەکان و خاڵی چەکەرەکردنی ئەم کۆمەڵەیە دەگەڕێتەوە بۆ ئەم سەرچاوانە:

١- سەرەتای سەرهەڵدانی دەگەڕێتەوە بۆ ئادەم و بگرە پێشتریش.

٢- دەگەڕێتەوە بۆ ڕۆژگاری یەهودییەت و بە ڕێکیش بۆ سەردەمی پادشا (هیرودوس / ئەغریپا) لەساڵی (٤٣) زایینی.

٣- دەگەڕێتەوە بۆ سەدەکانی ناوەڕاست.

٤- دەگەڕێتەوە بۆ ئەورووپا و بە ڕێکی بۆ ساڵی (١٧١٧)ی زایینی.

دوای خستنەڕووی هەر یەك لەو بۆچوونانە، هەروەها خوێندنەوە بۆ هەر یەك لەو سەرچاوانە، کە هەر یەکەیان مێژوو و ڕەگ و ڕیشەی سەرهەڵدانی ماسۆنیزم دەبەستێتەوە بەقۆناغ و مێژوویەکی دیاریکراوەوە. بە دیقەتدان لەهەموو ئەو سەرچاوانە ئەو بڕوایەی لا دروست کردووم مێژووی سەرهەڵدانی ماسۆنیزم دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی فەرمانڕەوایەتی پادشا (هیرۆدۆس/ ئەغریپا) ئەمەش بەتەواوی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (٤٣)ی زایینی، کە یەکەمجار بە ناوی هێزی شاراوە (القوة الخفية)وە سەریهەڵداوە و کۆمەڵێك ئامانج و بەرنامەی نهێنی و شاراوەی هەبووە، پاش چەندین قۆناغ لەهەڵکشان و داکشان، تاکو بەفۆرم و بەرنامە و

ئامانجی فراوانترەوە و تەنانەت بەناوێکی ترەوە کە ئەوپش، ماسۆنییەتە لە ساڵی (١٧١٧) لە بەریتانیا دێتەوە مەیدان و لە بەشی هەرە زۆری وڵاتانی ئەورووپا و دونیادا گەرا دادەنێت و بە سەدان مەحفەل دەکاتەوە.

کەواتا بە پێی تێڕامانی ئێمە ماسۆنیزم بە دوو قۆناغی زۆر لەیەکتر جیاوازدا چەکەرەی کردووە و لە چەندین بواردا جیاوازییان هەبووە، هەروەها ڕەوتی دروستبوون و گەشەکردنی ئەم کۆمەڵەیە لە زۆربەی قۆناغەکاندا تێکەڵ بە ژیان و خەسڵەت و تایبەتمەندییەکانی چەندین ڕێکخراوی نهێنی تر بووە، یان وردتر پرۆسەی گەشەکردن و نوێبوونەوەی ئەم کۆمەڵەیە جۆرێک لە ئاوێتەبوونی لە نێوان ئەو ڕێکخراوەو باقی کۆمەڵە و ڕێکخراوە نهێنییەکانی تردا دروست بووە، هەر ئەمەش ئەو تێڕامان و گومانەی لای گەلەك لە مێژوونوس و شارەزایان دروست کردووە، گوایە جۆرێك لە پەیوەندی و نزیکایەتی لە نێوان ماسۆنیزم و ژمارەیەك لەو ڕێکخراوە نهێنییانەی تردا هەیە، هەندێکیش لەمە زیاتر چوونە و پێیان وایە بەشی زۆری ئەم ڕێکخراو و کۆمەڵانە تەواوکەری یەکن و لە ژێر پەردە و ناوی جیاجیادا کاریان کردووە و خاوەنی یەك ئامانج بوونە، وەلێ ئەم ڕایە تا ئەندازەیەك دروست نییە، ڕەنگە جۆرێك لە هاوشێوەیی هەبێت، بەڵام مەرج نییە لە بنەچەدا یەك ڕێکخراو بن و خاوەنی یەك ئامانجی یەکگرتوو بن وەك ئەوەی بەشێکی زۆر لە توێژەرە عەرەبەکان ئاماژەی بۆ دەکەن.

# سەرهەڵدانی ماسۆنیزم بە شێوە هاوچەرخەکەی

ئێمە پێشتر باسمان لەوە کرد، ڕەگ و ڕیشەی ماسۆنیزم زۆر کۆنە و سەرچاوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ هێزی شاراوە (القوة الخفية) لە سەرەتاکانی سەرهەڵدانی ئاینی نەسرانیدا، دیارە بۆ ڕاستی ودروستی ئەم ڕایەش بەشی هەرە زۆری توێژەر وشارەزایان کۆکن. ماسۆنیزم هەر لەو ڕۆژگارەوە بە چەندین قۆناغی هەڵکشان و متبوون گوزەری کردووە، بەڵام بۆ هەر قۆناغێك بە فۆرمی جیاوازەوە، تاکو لە سەرەتاکانی سەدەی هەژدەدا لە وڵاتی بەریتانیا بە شێوازێکی نوێتر و هەروەها بە پاراستنی هەندێك لە نهێنییەکانیەوە سەرهەڵدەداتەوە، لەم بارەوە هاتووە: لە ساڵی ١٧١٦ز هەریەك لە (لاڤ) لەگەڵ ئیبراهیمی کوڕی و زاواکەی بە ناوی (ابراهيم ابيود) کە هەموویان جولەکەن، خاوەن و هەڵگری نوسخەیەك دەبن لە پرەنسیپ و دروشم و بەرنامەکانی هێزی شاراوە و دەکەونە گەڕان بە مەبەستی بڵاوکردنەوەی لە وڵاتاندا، باشترین جێگاش بۆ سەرهەڵدانی ئەم گروپە (لەندەن) دەبێت بەهۆی دێرینی و گرنگییەوە، بۆ ئەوەی ببێتە شوێنێك بۆ گردبوونەوەی ئەندامە شاراوەکان، بۆیە لەگەڵ دوو پیاوی دیاری ئینگلیزدا کۆدەبنەوە و دوای ئەوەی ئامانجەکانیان دەخەنەڕوو، یەکسەر ڕەزامەندی خۆیان

پیشان دەدەن بۆ بەجێهێنانی ئەو مەبەستە، ئەوانیش هەر یەك لە (دیزا كولیة) و(جورج) دەبن.

بێگومان ئەم هەنگاوە سەرەتایەك دەبێت بۆ زیندووكردنەوەی هێزی شاراوە، بەلاّم بە شێواز و ناوێكی ترەوە، دواتر خۆشەویستی و یەكترناسینی تەواو لە نێوان هەردوو لایاندا دروست دەبێت، ئیدی ئەوانیش بەشێك لە نهێنییەكانی ئەو هێزە بۆ هاوڕێ تازەكانیان ئاشكرا دەكەن و نوسخە ئەسڵەكەیان دەخەنە بەردەست، لەگەلّ پاراستنی نهێنی گەوهەری ڕەگ و ڕیشەی ئەم هێزە تەنها بۆ خۆی و كوڕەكەی، پاشان باس لەوە دەكەن هەولّ بدرێت ناوەكەی بگۆڕن بۆ ناوێكی نویّ و بگونجیّ لەگەلّ سەردەمدا، هەروەها هەندێك لە یاساكانی هەموار بكرێت بەئامانجی ئەوەی زیاتر خەڵك پەیوەندییان پێوە بكات، وەك ئەڵتەرناتیڤێك بۆ ناوی (جمعیة القوة الخفیة) بۆ هەر یەكەیان دە ڕۆژ مۆڵەت دەدەرێت تاكو هەر یەكەیان سیّ ناو پێشنیار بكەن، سەبارەت بە ناوە تازە پێشنیاركراوەكە هاتووە: دوای بەسەربردنی دە ڕۆژ هەموویان گەڕانەوە و كۆبوونەوە، هەر یەكەیان سیّ ناوی ئامادەكردبوو، بەلاّم هەموویان ڕەزامەندییان نیشاندا بە تایبەتی (دیزا كولیة) لەسەر یەكێك لەو ناونەی كە (لاڤ) پێشنیاری كردبوو، ئەویش ناوی (فرانما سونیري) بوو، كە بە مانای بنیاتنەری سەربەست دێت، ئەمەش بەرێكی لە (٢٥/ئابی سالّی ١٧١٦) زایینی بووە.

دەربارەی هەڵبژاردنی ئەم ناوە دەبێتە جێگای خۆشحاڵی و ڕەزامەندی هەموویان، ئەم ناوەش هەروا لە خۆڕا نەبووە، بەڵكو ڕەگ و ڕیشەكەی چەندین سەرچاوەی هەیە وەك:

یەكەم: ئەم ناوە هەمان ئەو ناوەیە كە ئەندازیارە ئیتالیاكان لە سەدەی سیازدەدا بە كاریان هێناوە(freem asons).

دووەم: ئەم ناوە هاوجووتە لەگەڵ زۆربەی هەرە زۆری ئەو هێما و سیمبولە كۆنانەی كە كاتی خۆی لە هێزی شاراوەدا بە كارهاتوون هەر لە ڕۆژگاری دامەزراندنیەوە.

سێیەم: كۆمەڵەكانی بنیاتنەرانی سەربەست و ئەندازیاران كە ئێستا هەن (مەبەستی ساڵی ١٧١٦زایینی)ە، هەموویان خاوەنی كۆمەڵ و مەحافل بوونە و تێیدا كۆبونەوەتەوە، بەمەبەستی پتەوكردنی پیشەكەیان كە ئەندازە و بنیاتنان بووە.

چوارەم: هەردوو وشەی (بناء meconnerie) و (بناءmacon) ئێجگار كۆنن.

بەكارهێنانی وشەی بنیاتنەر یان (بناء) بۆ ناوهێنانی ئەم كۆمەڵەیە، هەرگیز بەو مانایە نییە، ئەمانە ڕۆژێك لە ڕۆژان كەرەستەكانی بیناكردنیان بە كارنەهێناوە، بەڵكو ئەم ناوە و كەرەستەكانیان تەنها وەك هێما و سیمبول بەكارهێناوە بۆ ئامانجەكانیان.

دەربارەی ناكۆكی نێوان (لاڤ) و (دیزا كولییە)یش هاتووە: دیزا كولییە توانیویەتی دەستنووسە ئینگلیزییەكە لە دامەزراندنی هێزی

شاراوه ببات، دوای دانانی ناوه نوێكه له (٢٥/اب/١٧١٦) مشتومڕ له نێوان لافی و دیزا كولییەدا دروست دەبێت لەسەر گێڕانەوەی دەستنوسە ئینگلیزیەكە، لە ئەنجامدا لافی دیار نامێنیت و هەموو ئەوراق و زانیارییەكان لەگەڵ خۆیدا دەبات، دواتریش له تۆڵەی (لافی)دا (جورج) دەكوژرێت.

بێ شك ئەم ناكۆكییە چەندین سەرچاوەی هەبووە، هەرچی لافی و هاوەڵە جولەكەكانی هەرگیز بەوە ڕازی نەبوونە دەستكاری بنەما و دەقەكانی دەستووری ماسۆنیزم بكەن و هەروەها سەرۆكایەتی كۆمەڵەكەش تەنها لە دەست خۆیان دا بمێنێتەوە و هەموو ئەو وشە و زاراوانەی كە بەكاردێن بەزبانی عیبری بێت، جگە لەمانەش گەلەك فاكتەری دیكەش سەرچاوە بوونە بۆ ئەم ناكۆكی و ململانێیە، ئەمەش بۆ جاری ڕاستییەكە ئەوە دەسەلمێنێ چ لەسەردەمی هێزی شاراوەدا و چ لەسەردەمی سەرهەڵدانی ماسۆنیزمدا بە ناو شێوازە نوێكەیەوە، مۆركێكی جولەكەیان هەبووە، ئەمەش ڕاستییەكە بە ئاسانی ناتوانرێت نكوڵی لێبكرێت.

كەواتا مێژووی سەرهەڵدانی ماسۆنیزم بە شێوە هاوچەرخەكەی و بەم فۆرم و ناوەی ئێستایەوە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٧١٦) كە بێگومان وڵاتی بەریتانیاش یەكەم وڵات و ژینگە بووە، بۆ سەرهەڵدانەوەی ئەم كۆمەڵەیە بەشێوە هاوچەرخەكەی.

# جۆرەکانی ماسۆنییەت

زۆریك لە شارەزایان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن، کۆمەڵەی ماسۆنییەت ڕێکخراوێکی ئاڵۆز (معقد) و شاراوەیە، خاوەن چەندین جۆر و پلە وتایبەتمەندییە، ئەمەش یەکێکە لە خەسڵەتەکانی ئەم کۆمەڵەیە، هەروەها دابەش دەبێت بۆ سەر سێ کۆمەڵە یان سێ جۆر، کە هەر یەکەیان خاوەنی تایبەتمەندی و هەیکەلی خۆیەتی لە ڕووی پلە و پایە و هێما و سروشتی کارکردنەوە، وەلێ لە هەمان کاتدا تەواو کەری یەکترن، بەهەرحاڵ ماسۆنییەت لە ڕووی پلە بەندی ڕێکخراوەییەوە دابەش دەبێت بۆ سەر سێ جۆر، کە ئەمانەن:

**یەکەم: ماسۆنییەتی سەرەتایی:** ئەم بەشە بریتییە لە ٣٣ پلە، چوونکە بۆ گەیشتن بە بەرزترین پلە لەم کۆمەڵەیەدا دەبێت ئەندام ئەم سیی و سێ پلەیە ببڕێت، کە دوا پلە پێی دەوترێت مامۆستای هەرە مەزن (الاستاذ الاعظم).

**دووەم: ماسۆنییەتی پادشایی:** ئەمە پلەیەکی قورسە و زەحمەتە و بە ئاسانی بەدەست نایەت، ئەو ئەندامەی دەگاتە ئەم قۆناغە دەبێت دەستبەرداری هەموو تایبەتمەندییە ڕۆحی و نیشتمانی و نەتەوەییەکانی ببێت و بگاتە دوا پلە، کە سیی و سێهەمینە، بۆچوونێك هەیە دەڵێت ئەم پلەیە یان ئەم جۆرە لە

ماسۆنیزم تەنها تایبەتە بە جولەکەکان، وەلێ ئەمە بۆچوونێکی دروست نییە، لەبەر ئەوەی چەندین کەس گەیشتونەتە ئەم قۆناغە و کەچی جولەکەش نەبوونە.

سێهەم: ماسۆنییەتی گەردوونی: ئەم پلەیە ئێجگار بالآیە لە کۆمەڵەی ماسۆنیزمدا، پڕە لە کاری نهێنی و شاراوەیی، هیچ زانیارییەکی ئەوتۆ نەزانراوە لەمەڕ سیستەم و ئەندام و شێوەی کارکردنی، بە زۆری ئەندامەکانی ئەم جۆرە لە ماسۆنییەت بریتین لە سەرۆکی مەحفەلەکان لە جیهاندا.

هەر سەبارەت بە جۆرەکانی ماسۆنییەت، جیاوازی زۆر هەیە لە نێوان توێژەر و شارەزایان دا، چ لەسەر ڕیزبەندی جۆرەکان چ لەسەر تایبەتمەندی هەر یەکەیان بەجیا، بەلآم ئەو دیدەی سەرەوە باشترین دید و ڕوانینمان دەخاتە بەر چاو لەسەر ئەم بابەتە.

# ئامانجەکانی ماسۆنیزم

بێگومان هەموو کۆمەڵە و پارت و ڕێکخراوێکی ئامانجی خۆی هەیە، سەرکردایەتی و ئۆرگان و ئەندامەکانی لە پێناو گەیشتن بەو ئامانجانە لێبڕاوانە خەبات دەکەن، باش وایە لە ڕێگای هەوادار و کەسە دیارەکانی ئەم کۆمەڵەیەوە لە مەبەست و ئامانجەکانیان تێبگەیەین، پاشان گەر بکرێت بیرو ڕای نەیار و دژەکانیش ڕوون بکەینەوە، بۆ ئەوەی هەر هیچ نەبێت وێنەیەکی دیار وەبەر چاوی خۆمان و خوێنەر بخەین، بەماناش دەکرێت ماهیەت و تایبەتمەندییەکانی ماسۆنییەتمان زیاتر بۆ ڕوون ببێتەوە:

لەم بارەوە (ایلیا الحاج) دەڵێت: مەبەست و ئامانجمان پێشکەشکردنی کاری خزمەتگوزارییە بۆ هەموو مرۆڤایەتی، بەتایبەتی مندالآنی بێ باوك و دایك و خزمەت گەیاندن بەبێوەژن، هەروەها ڕێبەرایەتیکردنی جیهان بەرەو (الحرية والمساواة والاخاء) ئازادی و یەکسانی و برایەتی، هەروەها دەڵێت ئێمەی بنیاتنەرانی ئازادی بەخش دەبێت بە ئەرکەکانی سەرشانمان هەڵبستین، کە بریتییە لە خۆشەویستی خوای گەورە و هەروەها خۆشەویستی خود و کەسانی نزیك.

هەرچی برا (شاهين بك مكاريوس) ە، سەبارەت بە مەبەست و ئامانجەکانی ماسۆنیزم دەبێژێت ( چ مەبەستێك لە مەبەستی ئەم

کۆمەڵەیە و ئامانجەکانی پیرۆزترە، کە دەکارێت خۆشەویستی و هاوکاری لە نێوان ئەندامەکانیدا پەخش بکات و بە دوور بن لە ناکۆکی و کینە و هاندانیان بۆ پێشکەشکردنی کاری خێرخۆازی و باشە لەگەڵ براکانیاندا، بەتایبەتی ئەوانەی کە گلاون بە گرفت و پێویستیان بە دەستگردن و هاوکاری هەیە، هەروەها دەبێت چاك بڕوانینە ئەو گرفت و کێشانە، کە مرۆڤایەتی دووچاری بووە و دەبێت کار بۆ چارەسەرکردنی بکەین...).

یەکێکی تر لە ڕێبەرانی ماسۆنییەت، کە ئەویش (جرجی زیدان)ە دوای قسەکردن لەسەر مێژوو ئامانج و مەبەستەکانی ئەم کۆمەڵەیە، پێی وایە مرۆڤ پێویستی بە ماسۆنییەت هەیە بۆ بڵاوکردنەوەی زانست و جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە، زانست بێ بوونی کۆمەڵە نهێنییەکان ناتوانێت گەشەبکات و بڵاو ببێتەوە. بەم پێیە بێت یەکێك لە ئامانجەکانی ماسۆنیزم برەو دانە بە زانست وەك کۆمەڵەیەکی گرنگ لە ژیانی مرۆڤدا.

لە لایەکی ترەوە کەسێك بە ناوی (حضرة کلي الحکمة الیاس بك) دەڵێت: مەبەست لە ماسۆنییەت تێکشکاندنی نەفامی و نەزانینە بە هەموو شێوەکانییەوە، هەروەها لە مەحفەلەکانی دا هەموو مشتومڕ وموجادەلەیەکی ڕامیاری وئایینی ڕەت دەکاتەوە، هەرچەندە ماسۆنیزم جێبەجێکردنی خواپەرستی و ئەرکە ئایینیەکان لە کەس قەدەغە ناکات...). بە کورتی دەکرێت ئامانج و

مەبەستەكانی ماسۆنیزم وەك ئەوەی لەسەر زاری ڕێبەرەكانییەوە هاتووە، لەم چەند ئامانجەدا خورد بكەینەوە:

- پێشكەشكردنی كاری خێرخوازی بە مرۆڤایەتی، بە تایبەتی مندالآنی بێ باوك و بێ دایك و بێوەژن وپەككەوتەو هتاد...
- چەسپاندنی گیانی لێبووردەیی و خۆشەویستی لە نێوان تاكەكانی كۆمەلگە و هەروەها ئەندامانی خودی كۆمەڵەكەیان.
- ئامانجی هەرە سەرەكی ماسۆنیزم بلآوكردنەوەی زانست و تێكشكاندنی جەهل و نەفامییە بەهەموو چەشن و شێوەكانییەوە.
- ڕێبەرایەتیكردنی جیهان بە ئاراستەی چەسپاندنی بنەماكانی ئازادی و یەكسانی و برایەتی.
- ڕێزگرتن لە مرۆڤ و كاركردن بۆ چەسپاندنی دادپەروەری.
- خۆشەویستنی خێزان و كەس و كار و كۆمەلگە و دەوڵەت و مرۆڤایەتی بە شێوەیەكی گشتی.
- ڕێزگرتن لە تایبەتمەندییە ئایینی و نەتەوەیی و نیشتمانییەكان.

بەم پێیە بێت، ئەوا جگە لە بەخشینی خێرو خۆشی و دادپەروەری و پێشكەشكردنی خێرخوازی بە مرۆڤایەتی، خودی ماسۆنییەت هیچ ئامانجێكی تری نییە، وەك ئەوەی نەیار و دژەكان قسەی لەسەر دەكەن و زۆر تۆمەت و شتی تریش خراوەتە ئەستۆی.

جا با بێینە سەر بیرو ڕای بەرەی دژە ماسۆنیزم، تاکو بزانین چۆن دەڕواننە ئامانج و مەبەستەکان و خوێندنەوەیان چییە بۆ ستراتیژیەتی ئەم کۆمەڵەیە، کە هەمیشە نوسەرە عەرەب و ئیسلامییەکان بە ڕێکخراوێکی تۆقێنەر و پڕ لە مەترسی بۆ سەر مرۆڤایەتی و ئایینەکان پیشانی خوێنەریان داوە گەلەك گومانی هەمە چەشنیان دروست کردووە، لە مەڕ ئامانج و مەبەستەکانی ئەم کۆمەڵەیە و نەهجی کارکردنیان:

بۆ نموونە کتێبی (السر المصون) هەموو ئەو ئامانجانەی کە باسکران لە سەرەوە بە درۆ دەخاتەوە و پێی لەسەر ئەوە دادەگرێت هەموو ئەوانە دروشم و ئامانجی چەواشەکارانەن بۆ چاوبەست کردنی خەڵك و تەنها کۆمەڵێك وتەی ڕووکەشن، وەلێ لە گەوهەردا بە پێچەوانەی ئەو ئامانجانەوە کار دەکەن و ئەوەندەی سەرقاڵی خۆ دەوڵەمەندکردنن کەمتر ئاگایان لە هەژار و لێقەوما و نەخۆشەکان هەیە، گەلێك ڕاو بۆچوونی کەسانی سەر بەم کۆمەڵەی ماسۆنییەت دەبینینەوە، کە پێیان وابووە ئەندامە دەست کورت و هەژارەکان، بونەتە مایەی گرفت و بارێکی قورس بۆ کۆمەڵەکە و گوایە هەندێکیان بە سوکی ڕوانیویانەتە ئەندامە هەژارەکانیان، لە بارەی ڕێزگرتن لە ئایین، هەمان سەرچاوە بە توندی ئەوە ڕەت دەکاتەوە گوایە ئەم کۆمەڵەیە ڕێز لە ئایین و باوەڕەکان دەگرن و ئەندامەکانیان ئازادن لە پەیڕەوکردنی بیروباوەڕە ڕۆحییەکانیاندا، ئەم پێی وایە ئامانجی سەرەکییان شێواندن و دژایەتیکردنی ئایینەکانی

نەسرانی و ئیسلام و ئەوانی ترە، بۆ سەلماندنی ئەم بۆچوونەش پارچە هۆنراوەیەکی گەورە کەسی ماسۆنی (شاهین مکاریوس) بە نموونە دەهێنێتەوە، تێدا سوکایەتی بە شوێنە پیرۆزەکان و پیاوانی ئایینی دەکات و دەڵێت:

الخير كل الخير في هدم الجوامع والكنائس

والشر كل الشر مابين العمائم والقلانس

ماهم رجال الله فيكم بل هم القوم الابالس

يمشون بين ظهوركم تحت القلانس والطيالس

لە بارەی دروشمەکانی(یەکسانی و برایەتی و ئازادی)یەوە، کە کۆمەڵەی ماسۆنییەت کردوویەتی بە دروشم و پەیامی سەرەکی خۆی، دوکتۆر (احمد غلوش) دەڵێت: (ان شعار المساواة والاخاء والحرية لا تعني الا مساواة اليهودي والاخاء معهم وضمان حرية العمل لهم )، واتە: (دروشمی یەکسانی و برایەتی و ئازادی هیچ مانایەك نادات، جگە لە یەکسانی بۆ جوولەکەکان و برایەتی لەگەڵیان و مسۆگەربوونی ئازادی کارکردنیان). کەواتا بەرزکردنەوەی ئەم دروشمانە لە لایەن ماسۆنییەتەوە تەنها لە بەرژەوەندی خودی جولەکەدایە و کەسیتر سوود لەم دروشمانە و بەرهەمەکانی نابینێت، هەر لەم بارەوە هاتووە ئەم کۆمەڵەیە لە رێگای چەندین یانە و شوێنی تایبەتەوە، لە ئەمریکا و ئەورووپا زەمینەی رەخساندووە بۆ بڵاوبونەوەی لەشفرۆشی و سێکس و لادانی جنسی، بە نموونە ناوی هەندێك لەو یانانە دێنی بە ناوی (sex shops) کە لە چەندین

ولاتدا بوونی هەیە، هەموو ئەمانەش بۆ لاوازکردن و کۆنترۆڵکردنی مرۆڤی غەیرە جولەکەیە.

هەندێك لە ژێدەرەکانی دیکە، زۆر لەمە فراوانتر و دوورتر ڕۆیشتون لە مەڕ ترسناکی و گەورەیی ئامانجەکانی ئەم کۆمەڵەیە، پێیان وایە ئامانجی نزیك و ئامانجی دوور مەودایان هەیە، بۆ چەسپاندنی تەواوی یاسا و دەستوور و سیستەمی ماسۆنییەت لە جیهاندا. لەم ڕوانگەوە توێژەر (عبدالمجید همو) ئامانجەکانی کردووە بە دوو بەشەوە، هەرچی ئامانجە نزیکەکانە، دەڵێت بریتییە لە سیی و پێنج ئامانج:

- ئامانجی موتروبەکردنی ناوترین گروپ و کۆمەڵی مرۆڤ بە بیر و ئایدیاکانی جولەکە.
- ماسۆنییەت گەورە و سەرۆەری پارتە ڕامیارییەکانە، نەك خزمەتکاریان بێت.
- دوای (١٠) ساڵ ماسۆنییەت وا دەکات هەموو کارێك بە ئارەزووی خۆی گوزەر بکات، بێ ئەوەی هیچ بەرگرییەك لە بەردەمیدا ڕوو بدات.
- مەبەست لە بوونی ماسۆنییەت تێکۆشانە لە دژی هەموو کۆمەڵە ستەمگەرەکان، کە ئینتیمایان دەگەڕێتەوە بۆ ڕابردوو، لە پێش هەموو مەسەلەیەکدا ماسۆنیزم وەك تەنها ڕێکخراوێك دژایەتی ئایین و نەتەوە و داب و نەریتەکان دەکات.

هەروەها لە مەڕ ئامانجە دوور مەوداکانیش، هەمان سەرچاوە دەڵێت بریتین لە:

- دامەزراندنی کۆماری دیموکراتی گەردوونی شاراوە.
- ئامانجی ماسۆنییەت پێکهێنانی کۆمارێکی نا ئایینی جیهانییە.
- ڕزگارکردنی هەموو نەتەوەکانە، کە ئامانجەکانی شۆڕشی فەڕەنسای ساڵی (١٧٧٩) نازانن، ئەم ڕۆژە دوور نییە و دەبێت برایەتی ماسۆنییەتی گشتی تەواوی گەلان و نیشتمانەکان بگرێتەوە.
- بنیاتنانی دەوڵەتی عەلمانی.

پرسیاری هەرە جدیی ئەوەیە، ئاخۆ لە مێژوودا ڕێکخراوێك یان کۆمەڵە و پارتێك هەیە، هەموو ئامانجەکانی دژ بەوانی تر بێت وەك ئەوەی باس لە ماسۆنییەت دەکرێت و تەنها خاوەنی یەك ئامانجی پۆزەتیڤ نەبێت، دیارە ئەمەشیان لۆژیك نییە و بیرۆکەیەکە ناتوانرێت پشتی پێی ببەسترێت، ڕەنگە بوارێك هەبێت کۆمەڵەیەك لە بەر بەرژەوەندییە باڵاکانی خۆی و دەوروبەرەکەی بخوازێت دژایەتی نەتەوەیەك یان گروپ و ئایینێك بکات، بێگومان ئەمەشیان بە ڕەهایی نییە، ناکرێت بڕوا بەم تێزە بکرێت کە دەڵێت کۆمەڵەی ماسۆنیزم جگە لە جولەکە و ئایینەکەی، دژایەتی هەموو گەلانی دونیا بە نەتەوە و ئایین و مێژووەوە دەکات، ئەگەرچی وەك هەر کۆمەڵەیەك ماسۆنییەتیش مافی ئەوەی هەیە بۆ خۆی خاوەنی پەیام

و ئامانج و بانگەشە بێت، بەڵام نەك وەك ئەوەی لەسەریان باس دەکرێت، بۆ نموونە دەکرێت بڵێین ئەم کۆمەڵەیە دژ بە نەتەوەی عەرەب و ئایینی ئیسلامن، بەڵام ڕەوا نییە یان جێگای عەقڵ نییە دژایەتیکردن بۆ هەموو مرۆڤایەتی بخەینە ئەستۆیان، ئەمەش گەر بکرێت دەچێتە خانەی سۆز و هەڵچوونەوە و لە چوارچێوەی توێژینەوەی ئەکادیمیدا کاری پێناکرێت.

هەرچەندە بۆ خۆم گومانم لەوە نییە، خودی ماسۆنیزم بزوتنەوەیەکی نهێنی و خاوەن ئامانجی دوور و نزیکە و بە دووریشی نازانم دژی ئایینێك یان نەتەوەیەك کاربکات بە قازانجی بەرژەوەندیەکانی خۆیدا، ئەمەش هەنگا و کارێکی نوێ نییە لەمێژووی سیاسی گەلاندا، بەڵام هەرگیز وەك ئەم کۆمەڵەیە قەبە و گەورە و بە مەترسی نیشان نەدراوە، هەر ئەمەش وامان لێی دەکات گومانمان لا دروست بێت.

وەك پێشتر دووابن ئەم کۆمەڵەیە لە هەموو قۆناغەکاندا مۆرکی جولەکەی پێوە دیارە و مەسەلەیەکی بابەتییە لە قازانج و بەرژەوەندییەکانی جولەکە کار بکات و تێبکۆشێت، ئیدی ناکرێت چ هێز و ئایین و نەتەوە هەیە بوونی ئەم کۆمەڵەیە بە مەترسی لە سەر خۆی و چارەنوسەکەی لە قەڵەم بدات، ئەوەی کە دیقەت دەدرێت ئامانج و پەیام و مەبەستەکانی ماسۆنیزم زیاد لە پێویست قەبە کراوە، بەتایبەتی خودی لێکۆڵەرە عەرەبی و ئیسلامییەکان زۆر بە گەورەیی دەڕواننە مەترسی و ترسناکی ئەم کۆمەڵەیە بۆ سەر

تەواوی مرۆڤایەتی، هەندێکیان پێش بینی ئەوە دەکەن لە چەند ساڵی داهاتودا تەواوی گەلانی جیهان دەکەوێتە ژێر سایە و لەلەمرەوی جولەکەوە، لە ڕێگای ئامانج و هەنگاوەکانی ئەم کۆمەڵەیەوە، بەلاَم خۆ ئەوە سەدان ساڵە ئەم کۆمەڵەیە بوونی هەیە، ژیانی مرۆڤایەتیش بە پێی بەرژەوەندی و خواستی زۆربەی گەلانی دونیا بەڕێوە دەچێت و جگە لە دروستبوونی دەوڵەتی ئیسرائیل هیچ لەو پێشبینیە نادروستانە بە ئاکام نەهاتوون، کەچی نەك ماسۆنیزم نەیتوانیوە بستێك لە خاك و نیشتمان یان ئایین و تایبەتمەندییەکانی گەلانی تر بسڕێتەوە یان لە ناوی بات، بەڵکو بە دووریشی دەزانم لە (٩٥٪) جیهانیش هەر بزانن ماسۆنییەت چییە و ئامانج و مێژوو و تایبەتمەندیەکانیشی چین، ڕەنگە هەنوکە ئەم کۆمەڵەیە خاوەنی چەند ملیۆن ئەندامێك بێت و کۆمەڵێك ئامانجی گەورە و بریقەداری هەبێت وەك هەر پارت و کۆمەڵە و ڕێکخراوێکی تر لە دونیادا.

## پەیوەندی نێوان ماسۆنییەت و جولەکە

پێم وایە ئەمەیان بابەتێکی گرنگە و زۆر لە مێژە جێگای مشتومڕ و لێدوانی جیاوازە، بۆیە جێی خۆیەتی بابەتیانە و دوور لە هەموو هەڵچوون و مەسەلەیەکی سۆزداری تیشك بخەینە سەری و بێ لایەنانە کاری لەسەر بکەین.

وەك ئاشکرایە هەرگیز لە هەردوو بەرەدا ناتوانرێت نکۆڵی لەو ڕاستییە بکرێت سەرهەڵدانی ماسۆنیزم جۆرێك پەیوەندی هەیە بەخودی جولەکەوە، ئەمەشیان لە ڕووی مێژوویی و پراکتیکییەوە سەلماوە و کەمتر پێویستی بە لێدوان و بەڵگە هەیە، ئەگەرچی هەنووکە ماسۆنییەت بووە بە ڕێکخراوێکی جیهانی پان و پۆڕ و ئەندام و سەرکردە و کەسی دیاری لە هەموو نەتەوە و ئایینەکانی تر هەیە، بەڵام ناکرێت مۆرکە جولەکەیەکەی فەرامۆش بکرێت. ئەگەر بێت و ئەو ڕایە دروست بێت کە دەڵێت ئەم ماسۆنییەتەی هەنووکە هەیە زادەی ڕابردووە و دەگەڕێتەوە بۆ هێزی شاراوەکەی ساڵی (٤٣)زاییینی سەردەمی پادشا (ئەغریپا) ئەوا بەڕێکی و هیچ گومانێکی ئەوتۆ شك نابرێت بۆ بنەچە یەهودییەکەی ئەم کۆمەڵەیە، لە بەر ئەوەی ئەو هێزە لە سەر دەستی (٩) کەسی جولەکە دامەزراوە و کاریان بۆ بەرژەوەندی ئاییِنی و نەتەوەیی جولەکە

کردووە، لە هەمبەر سەرهەڵدان و بلاوبونەوەی مەسیحییەتدا ئەمە لەلایەك، لەلایەکی تریشەوە دەکرێ پشت بە چەندین ڕاو بۆچوونی کەسە دیارەکانی ماسۆنییەت ببەستین بۆ ئەم بابەتە، لەگەڵ بەهەند وەرگرتنی ڕاو سەرنجی توێژەرە نەیارەکانی ئەم کۆمەڵەیە، کە پێکەوە دەمانخەنە سەر ئەو سککەیەی کە پەیوەندییەکی جیدی و بنەڕەتی لە نێوان هەردوولادا هەبووە و هەیە.

- حاخامی جولەکە (اسحاق وایز Isaac wise) لە ژمارە (٣)ی گۆڤاری (Israalite of america)، کە دەکاتە مانگی ئابی ساڵی (١٨٦٦) دەڵێت (ماسۆنییەت دەزگایەکی جولەکەیە بە مێژوو و ئاستی پلە و نهێنییەکانییەوە، لە سەرەتاوە تا کۆتایی هی جولەکەیە ).

هەروەها توێژەرەکان چەندین بەڵگەی تر دەخەنە بەر دەست بۆ سەلماندنی بوونی ئەم پەیوەندییە گەوهەری و بنەڕەتییە، بۆ نموونە (عبدالمجید همو) دەڵێت گەلەك فاکتەر هەن ئەوە دەسەلمێنن، کۆمەڵەی ماسۆنیزم تەواوکەری مەبەست و ئامانجەکانی جولەکەیە و بەڵکو پرۆژەیەکە لە ژێر ناوێکی پەردەپۆشکراودا بە ئامانجی هێنانەدی ئامانجەکانی جولەکە بە شێوازی جودا جودا، لەم بارەوە چەند نموونەیەك دەخاتە بەر دەست.

- زۆربەی پلە و سیمبول و ڕێوڕەسمەکانی ماسۆنیزم بۆنی جولەکەی لێ دێت، بەڵکو ئاماژەن بۆ تایبەتمەندی و داب و نەریتەکانیان.

- کاتێك مەحفەلی مەزنی ئینگلتەرا دامەزرا، بەشی هەرە زۆری مامۆستا و ڕێبەرەکانی دەسەلأت بەدەست لەو شوێنەدا بریتیی بوونە لە کەسانی جولەکە و ناوی چەندین ڕێبەری گەورەی ئەو مەحفەلە دەهێنینەوە، کە بە بنەچە جولەکە بوونە و لە قۆناغە جیاجیاکاندا سەرۆکایەتی مەحفەلی مەزنی ئینگلتەرایان کردووە.

وەك:

- ئەنتوان سان بییر، سالّی (١٧١٧).
- جۆرج بابن، سالّی (١٧١٨).
- دیزا کولییە، سالّی (١٧١٩).
- جۆرج بابن، سالّی (١٧٢٠).
- جۆن دۆك دی مۆنتاك، سالّی (١٧٢١).
- فیلیپ دۆك دی وارتن، سالّی (١٧٢٢)
- فرەنسیس سکوت، سالّی (١٧٢٣).
- شاس لیدکس، سالّی (١٧٢٤).
- دوکتۆر جیمس هاملتۆن، سالّی ١٧٢٥).
- هێنری فریدریك، سالأنی (١٧٨٢-١٧٩٠).
- برەنس جۆرج، سالأنی (١٧٩٠-١٨١٣).
- اوغست فریدریك، سالأنی (١٨١٣-١٨٤٣).

ڕەنگە هەموو ئەم ڕاستیانەی لای خوارەوە بەس بن بۆ ئەوەی
بسەلمێنرێت نەبێت نكۆڵی لە هاوپەیوەستی نێوان جولەكە و كۆمەڵەی
ماسۆنییەت بكرێت:

- ئەو (٩) كەسەی سەرەتا هێزی شاراوەیان دامەزراند جولەكە بوونە، پاشانیش دروستبوونەوەی ماسۆنیزم بە شێوە هاوچەرخەكەی دیسان لەلایەن كۆمەڵێك جولەكەوە دامەزراوەتەوە.
- تایبەتمەندییەكان و ڕێوڕەسمەكان، هێما و نهێنییەكان و سیمبول و ئاماژەكان و ڕێوڕەسمەكانی ماسۆنییەت، بەشێكی زۆریان لە ڕووی گەوهەرییەوە مۆركی جولەكەیان هەیە.

ئیدی لانی كەم ئەم ڕاستیانە گەواهین و چەردە و بەڵگەن بۆ سەلماندنی بوونی پەیوەندی لە نێوان ماسۆنیزم و جولەكەدا.

# ئیشکالیەتی نێوان ماسۆنیزم و ئایین

هەر لە ڕۆژگاری دروستبوونی هێزی شاراوە و دواتریش دروستبوونی ماسۆنییەت بەم فۆرمەی ئێستایەوە، پەیوەندی نێوان ئەم کۆمەڵەیە و ئایین دوو بابەتن بە چەندین.تێڕوانینی دژ بە یەك و ناکۆك و هەندێکجار هاوتەریبیش بینراوە، تا ئەو ئەندازەیەی زۆرترین مشتومڕ و لێدوانی لێ کەوتووەتەوە بە هەردوو دیوی ئەرێ و نەرێدا، خودی ئەم بابەتە زۆرێك لە توێژەر و شارەزایانی بۆ سەر دوو بەرەی دژ بەیەك یان جودا دابەش کردووە و لە نێوەندەکاندا هەڵای زۆری لەسەرە.

زۆرێك لە پسپۆڕ و بە ئاگایانی ئەم بابەتە، هەمیشە ماسۆنیزمیان وا وێناکردووە، کە ئامرازێکە یان چەترێکە بۆ خزمەتکردنی جولەکە لە ڕووی نەتەوەیی و ئایینیەوە، ئەگەریش ئەم بۆچوونە دروست بێت ئەوا بە هەردوو باردا، تێگەیشتنەکان چوون یەك دەبنەوە، چوونکە لە لایەك ماسۆنیزم هەوڵێکە بۆ پاراستنی بەرژەوەندی وتایبەتمەندیەکانی جولەکە، لە لایەکی تریشەوە دەکارێت بە ئاقاری لاوازکردن و شێواندنی ئایینەکانی تردا، بە تایبەتی هەردوو ئایینی مەسیحی وئیسلام، هەنگاوی سیستەماتیك وتێکشکێنەر بنێت بۆ ئەو ئامانجە.

بێشك ڕوانین وبۆچوونەكان مەودای جیاوازی نێوانیان هێجگار دورە، هەرچی بەرەی دژە ئەوا بێ وەستان ماسۆنیزم بەوە تۆمەتبار دەكەن گوایە ئامانجی سەرەكییان لە ناوبردنی ئایین ولاوازكردنی بڕوای مرۆڤە بە یەزدان وكالْكردنەوەی بیروباوەڕە بە میتافیزیكاو فەلسەفە ڕوحییەكان و پەلكێش كردنی مرۆڤە بۆ نێو دونیای مادییەت و فەرامۆشكردنی لایەنی ڕوحی لە نێو تێكڕای كۆمەڵگەدا، ئەمە لە كاتێكدایە هەندێك لە مامۆستا و ڕێبەرە دیارەكانی ماسۆنیزم ئەم بۆچوونە بە ڕەهایی ڕەت دەكەنەوە، لە هەمبەردا كۆمەڵێك لە ڕێبەر وشارەزایانی ئەم بوارە دیدێكی جیاوازتریان هەیە وجەخت لە سەر ئەوە دەكەنەوە، ماسۆنیزم بەو ڕەهاییە دژ بە ئایین نییە، بەڵكو ڕێز لە ئایین و مەسەلە ڕوحییەكان دەگرێت و مرۆڤ ئازاد و سەربەست دەكات لە مامەڵەكردنیدا لە هەمبەر ئایین و تایبەتمەندیەكانی.

بەهەرحاڵ دەكرێ بچینە سەر تێڕوانین و بۆچوونی بیریار وشارەزایانی هەردوو بەرە، بە مەبەستی دروستبونی تێگەیشتنێكی تارڕادەیەك دروست و قبوڵكراو لە مەڕ ئەم بابەتە. لەم بارەوە بەرەی داكۆكیكار لە ماسۆنییەت بەم چەشنە دەڕواننە پەیوەندی نێوان ئایین و ماسۆنیزم:

- كەسێكی وەك (ایلیا الحاج) لەم بارەوە دەڵێت (ان الماسونیة تشتمل علی محبة اللة ومحبة القریب). واتە:

ماسۆنیزم بریتییە لە سۆزداری بۆ خوا و هەروەها سۆزداری بۆ خزم و کەسوکار.

• هەرچی (شاهین مکاریوس)ە، بە هەمان دید بەڵام بەکەمێك جیاوازییەوە دەڕوانێتە زنجیرەی پەیوەندی ئەرێنی ئەم دوو بابەتە و دەڵێت (ان الماسونیة دستورها الاساسي الایمان بالله وخلود النفس). بەم پێیە بێت بنەچەی دەستووری ماسۆنیزم لەسەر ئەویندارى و بڕوابوون بە خوا و مانەوەی ڕۆح بە هەمیشەیی بنیاتنراوە، وەك ئەوەی دەستووری ئەم کۆمەڵەیە لەسەر بنچینەی پەیامی ئیلاهی داڕێژرابێت و خۆشەویستییان بۆ خوای مەزن گەورەترین ئامانجیان بێت، وەك دەزانرێت ئەمە دید و بۆچوونی کەسێکی دیاری ئەم کۆمەڵەیەیە، کە لەساتە وەختی خۆیدا بەم چەشنەی سەرەوە دەربڕیون.

• لە لایەکی ترەوە (الیاس بلد منس) دەبێژێت (الماسونیة لاتمنع احدا من ممارسة فروضه الدینیة). ئەم بۆچوونە هەندێك لەوانی تر جیاوازەوە، تەنانەت بە جێگەیاندنی مەراسیم و سروت و ئەرکە ئایینیەکانیش بە پەسەند دەزانێت و هەرگیز ڕێگری لەبەرانبەر بە جێگەیاندنی هەموو ئەوانەدا ناکات و بە شیاویان دەزانێت و مرۆڤەکانیش لەم بوارەدا سەربەستن.

ئەم بیروڕایانەی سەرەوە بریتین لە تێگەیشتن و تێڕامانی چەند کەسێکی دیاری نێو کۆمەڵەی ماسۆنییەت لە جیهانی عەرەبیدا، هەرچەندە ئەمانە پتر کەسە ڕۆژهەڵاتیەکانی نێو ئەم کۆمەڵەیەن،

ئەمانە پێکەوەڕا جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە، کە هەرگیز ماسۆنیزم دژ و ناکۆك نییە لەگەڵ ئایینە ئاسمانییەکان و ئەندامەکانی سەربەست دەکات لە بەرانبەر پراکتیزەکردنی بیروباوەڕە ئایینییەکاندا، لەهەمان کاتدا هەر لەم بارەوە تیڕوانین و بۆچوونی کۆمەڵێك ڕێبەر و کۆنفراسی دیکەی ئەم ڕێکخراوە بۆ ئایین زۆر توند و جیاوازن و ڕاشکاوانە بەرانبەر بە ئایین وەستاونەتەوە و تەنانەت بە مەترسی و ناڕاست و گێرەشێوێنی نێو کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی لە قەڵەمیان داوە و بەتوندی هێرشیان کردووەتە سەر ئایینەکان و تەنانەت خواش. لەم بارەوە دەگرێت بگەڕێینەوە سەر وتە و سەرنج و بۆچوونە تایبەتەکان کە بەم ئاڕاستەدا کاریان کردووە و بیروڕای خۆیان پێشکەش کردووە:

- لە یەکێك لە کۆنفرانسەکانی ماسۆنییەتدا لە برۆکسل و بەرێکی لە ساڵی (١٨٦٦)دا بە ئاشکرا هاتووە: (بأن التوراة هي مجموع خرافات واكاذيب واراء فاسدة). ئەمە وتەیەکی سەرپێیی نییە یان بۆچوونێکی هاکەزایی ڕووت نییە، بەڵکو ئەمە ڕاگەیەندراوی یەکێك لە کۆنگرە دیارەکانی ئەم کۆمەڵەیە، تێیدا ڕاشکاوانە هەموو ناوەڕۆکی (تەورات) بە ئەفسانە ودرۆ و دەلەسە و بیرو ڕای ناشایستە لە قەڵەم دەدات وتەنانەت پێی وایە تێکدەرە و نابوتە.
- (الاخ مورات murat) لە کۆنگرەی ساڵی (١٨٩٤)دا وتەیەك پێشکەش دەکات و تێیدا بە ڕاشکاوی دەبێژێت: (ليس

في العالم سوى جوهر واحد وذات واحدة وهي المادة والالة الحقيقي هو المادة). لەم وتەیەدا زۆر بە ڕونی بانگەشە بۆ سڕینەوەی هەموو ئایینەکان کراوە، تەنانەت مەسەلەی بوونی یەزدانیشی بە ناڕاست ئەژمار کردووە وپێی وابووە تەنها یەك خود ویەك خوا بوونی هەیە، ئەویش ماددەیە.

• هەر وەك لە یەکێك لە بڵاوکراوەکانی مەحفەلی فەڕەنسای مەزندا لە ساڵی (١٩٢٢) هاتووە، چەندین پەلامای تێدایە بۆ ئەندامانی کۆمەڵەکەیان، کە هەرگیز دوو دڵ نەبن لەهێرشکردن بۆ سەر هەموو ئایینەکان، چونکە پێیان وابووە دوژمنی ڕاستەقینەی مرۆڤایەتین، هەر لەم بارەوە یەکێکیان دەڵێت: (ان غايتنا قبل كل شيء هي أبادة الاديان). لێرەدا زۆر بە ڕونی و بێ هیچ ڕتوشێك ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، کە ئامانجی لە پێشینەیان لە ناوبردنی ئایینەکانە، چونکە مەترسین بۆ سەر مرۆڤایەتی.

هەروەها ژمارەیەك برا (الاخ) لە نێو ئەم کۆمەڵەیەدا، بەم شێوەیە دیدو بۆچوونی خۆیان سەبارەت بە ئایین دەربڕیوە، کە هەموویان پێکڕا دژایەتی بێ پێچ و پەنای خۆیان بۆ ئەم مەسەلەیە دەربڕیوە:

• (بیرجیە) کە برایەکی ماسۆنییە لە پاریس وتویەتی: ماسۆنییەت جگە لە ڕەتکردنەوەی بوونی ڕەگەزی ئایین هیچی تر نییە.

- (برۆدون) کە ڕێبەرێکی ماسۆنییەتە دەڵێت: ماسۆنییەت بەواتای ڕەتکردنەوەی جەوهەری ئایین دێ، هەر کاتێکیش ماسۆنییەت وتی خوا هەیە، ئەوا مەبەستی سروشت و هێزەکانی مادییەتە.
- (فرنند فاوری) سکرتێری کۆنگرەی ماسۆنییەت دەڵێت: پێویستە لەسەرمان هەموو هێز و بوونێکی ئایینی لە فەڕەنسادا لەڕەگ و ڕیشەوە دەربهێنین، ئیتر هەر چ هێزێکی ئایینی بێت و لە هەرچ قاوغ و بەهێکدا بێت.

وەك دیقەتماندا خودی ڕێبەر و کەسە دیارەکانی ماسۆنییەت بۆ سەر دوو گروپ دابەش بوونە، گروپێکیان پێیان وایە ماسۆنیزم دژی هیچ ئایین و بڕوایەك نییە، بەڵکو لەدامەکانی سەربەست دەکات لە پەیڕەوکردنی ئایین و بیروباوەڕەکانیان، هەرچی گروپی دووەم هەیە زۆر بەئاشکرا و ڕاشکاوانە دژایەتی خۆیان بۆ هەموو جۆرە ئایین و بڕوایەك دەردەبڕن، تەنانەت پێیان وایە جگە لە مادده هیچ خوایەکی تر بوونی نییە، لە بەرانبەردا تەواوی نوسەر و توێژەرە عەرەبی و ئیسلامییەکان ماسۆنییەت بە دوژمن و نەیاری سەرسەختی هەموو ئایینەکان لە قەڵەم دەدەن، هەندێکیشیان پێیان وایە جگە لە ئایینی جولەکە، ماسۆنیزم دژی هەموو ئایین و ڕێبازو باوەڕەکانی دیکەیە. کاتێك ورد سەرنجی وتە و بۆچوونی بەشی هەرە زۆری مامۆستا و ڕێبەر و کەسە دیارەکانی ئەم کۆمەڵەیە دەدەیت، بێ هیچ ڕتوشێك ئەو ڕاستییەت بۆ ساغ دەبێتەوە، ئامانجی لە پێشینەی ئەم

کۆمەڵەیە ڕەتکردنەوەی تەواوی ئایینەکانە و بگرە دیدیان بۆ باوەڕ و ئایینەکان دیدێکی نەگەتیڤە هەرچەندە ژمارەیەکی کەمیان وا دەڕوانن ئەم کارەیان لە خزمەتی ئایینی جولەکەدایە.

# ئایا ماسۆنییەت ڕێکخراوێکی ڕامیارییە؟

هەموو جۆرە ڕێکخراو و ئایینێك لە مێژوودا، فۆرم و قاوغی خۆی هەیە لەڕووی تیۆری و پراکتیکییەوە، للإیك نییە هەموو ئەو بابەتانەی کە لە نەزای ڕێکخراو و کۆمەڵەکاندا دەخولێنەوە، یەك بچم و یەك بەرنامە و پەیامی هەبێت، بەڵکو هەست بە جیاوازی زۆر دەکرێت لە هەموو کایە جیاجیاکاندا.

پەیوەندی نێوان ماسۆنیزم و سیاسەت، پەیوەندییەکە بێشك ئەوە دێنێ لە سەری بوەستین، تاکو بە ڕێکی بزانین ئەم کۆمەڵەیە چ جۆرە فۆرمێکی هەڵگرتووە، ئایە کۆمەڵەیەکی خێرخوازی ڕووتە یان کۆمەڵەیەکی ئایینی و ڕۆحییە، یانیش کۆمەڵەیەکی ڕامیارییە بە تەنها؟ یانیش کۆمەڵەیەکە بە بەرنامە و ئامانج تێهەڵکێشە لە نێو هەموو ئەو کایە جیا جیایانەدا، جا بۆ ئەوەی مۆرك و سروشتی ئەم ڕاستییە بزانین، چاك وایە شەنوکەوی نێو ژێدەرەکان بکەین بەو ئامانجەی بگەیەنە ئاکامێکی دروست لەمەڕ ئەم پەیوەندییە، کە هەر لە مێژە جێگای مشتو مڕە، سەرەتا لەوەوە دەست پێ بکەین خودی ڕێبەرەکانی ئەم کۆمەڵەیەش نکۆڵییان لەو ڕاستییە نەکردووە، کە ئەم کۆمەڵەیە مۆرکێکی سیاسیانەی هەیە و هەر بۆ خۆیشی هەڵگری پەیامێکی سیاسی پڕ لە نهێنی و پەردەپۆشکراوە، لەم بارەوە چەندین ڕێبەری دیاری ئەم کۆمەڵەیە بەم چەشنە دواون:

• (بلان) ئەندامی مەحفەلی پاریسە و دەڵێت (نعم انه لامر ثابت و مقرر بأن الماسونية مشروع سياسي وانما هذا فخرها) ئەمە دان پینانێکی ئاشکرایە بەوەی ماسۆنییەت لە بنەڕەتدا پرۆژەیەکی سیاسییە و خودی کۆمەڵەکەش شانازی بەمەوە دەکات.

• (غونار) لە مەحفەلی پاریس دەڵێت: (اننا في محافلنا نسعى بأعمال السياسية وسياستنا هي نعم السياسة، فأن الابحاث السياسية والاجتماعية هي غايتنا الخاصة التي نجاهر بها علنا)، ئەم کابرا ماسۆنییە زۆر ڕاشکاوانە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات لەمەحفەلەکانیاندا کاری سیاسی پلانەی خۆیان دەکەن و زۆریش خۆشباوەڕن بەو سیاسەتەی کە کاری لەسەر دەکەن، هەروەها هەوڵ و تەقەللا ڕامیاری و کۆمەلایەتییەکان ئامانج و مەبەستی تایبەتن و بە ئاشکرا کار بۆ سەرخستنیان دەکرێت، وتەی ئەم پیاوە زۆر ڕوونە لەبارەی میتۆد و کاری سیاسیانەی ئەم کۆمەڵەیەوە، تەنانەت کردەی سیاسیش لەنێو مەحفەلەکانیاندا بە ئەرکی سەرەکی خۆیان دەزانن.

• شێخی گەورەی مەحفەلی پاریس ناوی (مونیت) بووە، زۆر ڕاشکاوانە وتویەتی سەرەتا خۆمان لە مەسەلەی ئایین و سیاسەت بواردووە، ئەمەشیان ترس بووە لە دەسەلات و پۆلیس، بەلام ئەمڕۆ بە ئاشکرا دەڵێم لە مەحفەلەکانماندا کاری سیاسی دەکەین، کە پێمان وایە باشترین جۆری سیاسەتە.

هەر سەبارەت بە هەمان بابەت، چەندین نموونەی ترمان لە بەر دەست دایە، کە ئاماژەن بۆ بە سیاسیبونی ئەم کۆمەڵەیە، چ وەك قاوغ و چوارچێوە چ وەك ئامانج و ناوەڕۆك، بۆ نموونە هاتووە:

- (الماسونية شركة سياسة غايتها تقويض اركان كل سلطة دينية او مدنية), لەم دەقەدا ئەم کۆمەڵەیە وەکو کۆمپانیایەکی ڕامیاری ڕووت پیشاندراوە، کە ئامانجی هەرە سەرەکی بریتییە لە بەرتەسکردنەوەی پایەکانی دەسەڵاتی ئایینی و مەدەنی، کەواتا ئەم کۆمەڵەیە هەمیشە سەرقاڵی کاری سیاسی و ململانێیە بۆ چەسپاندنی ئامانجەکانی، ئەمەش بۆ خۆی پەیامێکی ڕوونە بۆ بە سیاسیبوونی ماسۆنیزم.

- سەرنوسەری گۆڤارێکی ناسراو بە ناوی (الجمهورية الماسونية) دەنوسێت و دەڵێت ماسۆنییەت ڕێبەر و پێشەوای هەموو پارتە سیاسیەکانە، ئەم ڕێبەرایەتیان دەکات و پارتەکان بە ئاڕاستەی فەرمانی خۆیدا دەبات.

- هەروەها چەندین مامۆستا و ڕێبەری دیاری ماسۆنیزم بێ هیچ ڕتوشێك یان دوو دڵییەك باسیان لەوە کردووە کە ئەوان لە چوارچێوەی کۆمەڵەکەیاندا کاری سیاسی ئەنجام دەدەن، بۆ نموونە نوێنەری پاریس (الميسو براش) و(الكونت دي توغوينتر) و مێژوونووسی پرۆتستانتی (هردر) لەو کەسانە بوونە کە پێیان وابووە ماسۆنیزم لە ناوەڕۆك و پراکتیکدا کۆمەڵەیەکی ڕامیارییە، هەروەها لە چەندین کۆنفرانس و مەحفەلدا بە ئاشکرا باس لەم پەیامە کراوە و

بەشی هەرە زۆری کار و چالاکییەکانی ئەم کۆمەڵەیەش بریتیی بووە لە سیاسەت.

دیارە گەلەك ڕووداوی ڕامیاری و کۆمەلآیەتی لە ڕابردوو ئێستادا کراونەتە نموونە گەلێك بۆ بوونی ڕۆڵی سیاسیانەی ئەم کۆمەڵەیە، ئەوەتا زۆرێك لە چاودێران ژمارەیەك زۆر لە ڕووداوە گەورەکانی جیهانیان خستۆتە ئەستۆی ئەم کۆمەڵەیە، لە نموونەی هەڵگیرسانی شۆڕشی گەورەی فەڕەنسا و دروستبوونی دەوڵەتی ئیسرائیل و سەرهەڵدانی چەندین جەنگ و کاولکاری ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ بە تایبەتی لە ئەورووپادا خراونەتە پاڵ ئەم کۆمەڵەیە، گوایە پیلاندانەر و فاکتەری سەرەکی بەشی هەرە زۆری ڕووداوە جیهانییەکانن، ئەمەش بۆ گەیشتن بووە بە ئامانجە ستراتیژی و باڵاکانیان بووە، هەر لە بارەی بارگراوی بوونی ئەم کۆمەڵەیە بە سیاسەت هاتووە: ماسۆنیزم کۆمەڵەیەکی سیاسیە، چونکە لە نێو مەحفەلەکانیدا هەوڵ دەدا بۆ ڕێکخستنی کاروباری گشتی وڵات بە پێی ئامانج و خواستەکانی خۆی، ئەوەش دیدێکی ناڕاستە کە دەڵێت ماسۆنییەت بە هیچ کارێکی سیاسی هەڵناستێت.

هەرچەندە کۆمەڵێك لە خودی ڕێبەرانی ماسۆنییەت، بە تایبەتی ئەوانەی کە ڕۆژهەلآتی و خەڵکی جیهانی ئیسلامی و عەرەبین، ڕاشکاوانە نکۆڵی لەوە دەکەن ماسۆنییەت هیچ جۆری پەیوەندی یان مۆرکێکی سیاسیانەی هەبێت، یان هەڵگری پەیامێکی ڕامیاری بوبێت، بەڵکو تەنها ئەرکی ئەم کۆمەڵەیە دژایەتیکردنی

نەفامی و جەهالەت و هەژارییە، ئەوەتا یەکێك لە ڕێبەرانی مەحفەلی میسری لە ساڵی (١٨٩٠)دەبێژێت: (غاية الماسونية هي مقاومة الجهل تحت جميع اشكاله وهي مدرسة تمنع في كل محافلها كل مجادلة سياسية او دينية).

بەم پێیە بێت ئامانجی هەرە سەرەکی ئەم کۆمەڵەیە دژایەتیکردنی جەهالەت و هەژارییە بە هەموو شێوەکانییەوە و تەنانەت لە مەحفەلەکاندا هەموو جۆرە موجادەلە و مشتومڕێکی ڕامیاری و ئاینی ڕەت دەکاتەوە ، هەمان سەرچاوە باس لەوەش دەکات تەنانەت لە کۆبونەوەکاندا گشت جۆرە ناکۆکی و گفتوگۆیەکی سیاسی قەدەغە کراوە و ڕێگەی پێ نادرێت.

دوای ئەم گەشتە بە نێو دید و تێڕوانینی هەوادار و ڕێبەرانی ئەم کۆمەڵەیەدا، لە مەڕ بوونی پەیوەندییەکی جەدەلی لە نێوان ماسۆنیزم و سیاسەتدا، بێشك ئەو ئاکامە بەرهەم دێت بە پێی بەشی هەرە زۆری بۆچوونەکان و ڕای گەورە پیاوانی ئەم ڕەوتە، بەڵێ پەیوەندییەکی گرنگ و هەستپێکراو هەیە لە نێوان سیاسەت و ماسۆنیزمدا، تا ئەو ڕادەیەی دەتوانین بڵێن ماسۆنییەت لە بنەچەدا بۆ خۆی ڕێکخراوێکی سیاسیە بەبەرنامە و کاریش بەو ئاڕاستەیەدا کاری خۆی دەکات، کاتێك دیقەتی پێکهاتە و گوتار و هەڵسوکەوت و ناوەڕۆکی ئەم کۆمەڵەیە بدەیت، زۆر بە ئاشکرا ئەو حەقیقەتە دەردەکەوێت لە کردار و گوتاردا، کۆمەڵەی ماسۆنیزم ڕێکخراوێکی سیاسییە بە چەندین باگراوندی جیاجیاوە، ئەگەر ئەوەش ڕاست

بێت ئەم ڕێکخراوە کاری خێرخوازیشی ئەنجام دابێت، ئەوا هیچ ڕێگریەك دروست ناکات لە بەردەم ئەوەی ئەم کۆمەڵەیە سیاسی نەبێت، بەڵام ئەوەی ئەم کۆمەڵەیە لەوانی تر جودا دەکاتەوە سروشت و پێکهاتە و ئامانجە فرە ڕەهەند و فرە لایەنەکانیەتی لە هەموو کایەکانی سیاسی و ئابوری و کۆمەلآیەتی و کلتوری و ئایینیەوە.

# مەحفەلەكانی ماسۆنییەت

هەر ڕێكخراو و پارت و ئایینێك، بێگومان شوێنێكی دەبێت بە ناوێكی تایبەت و هەڵبژێردراوەوە تاكو ببێتە بارەگا و ناوەندێك بۆ ڕاپەڕاندنی كاروبارەكانیان، هەروەها تاكو ببێتەماڵێك بۆ گردبوونەوەی ئەندام و هەوادارانیان، ئەمەشیان هەنگاوێكی سروشتی و دروستە.

كۆمەڵەی ماسۆنییەتیش وەك هەر دیاردەیەكی ڕێكخراوەیی تر بۆ ناوهێنانی ئەو شوێنەی كە دەبێتە ناوەند و جێگای كۆبونەوەیان، مافی خۆیان بوو هەر لە سەرەتاوە ناوێك بۆ ئەو شوێنە هەڵبژێرن، كە ئەویش ناوی لێنرا مەحفەل(المحفل) دوای دروستبونی ماسۆنیزم بە شێوە هاوچەرخەكەی، بڕیاری دروست كردنی یەكەم مەحفەل لە جیهان درا، ئەویش (مەحفەلی ئینگلیزی) بوو، وردە وردە ئەم كۆمەڵەیە بەهمی وەرگرت و گەشەی فراوانی بە خۆوە بینی، هەروەها بووە خاوەنی پەیڕەوێكی ناوخۆ لەساڵی (١٧٢٧) پاشان دەستورێكیشی بۆ ئامادەكرا بەناوی (كتاب الدستور الماسوني) كە لە لایەن دوكتۆر (جیمس اندرسون)وە ئامادەكرابوو، هەروەها بنەما و ڕێساكانی و چۆنیەتی پەیوەندی نێوان ئەندام و سەركردەكانی تێدا دیاریكرابوو، سەبارەت بە دروستكردنی یان كردنەوەی یەكەم

مەحفەلی ماسۆنی، ئەوا مێژوونووس و شارەزایان لەسەر ئەوە کۆکن مێژوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٧١٧).

لەم بارەوە وا هاتووە: بنیاتنەران لە (٢٤/حوزەیرانی ساڵی ١٧١٧) کۆبوونەوە و هەموو کۆمەڵەکانی بنیاتنەر یەکیانگرتووە و پاشان یەکەم مەحفەلیان دروستکرد بە ناوی (مەحفەلی ئینگلیزی) کە پێشتر ناوی (مەحفەلی ئۆرشەلیم) بووە.

پاش ئەم ڕووداوە لە زۆربەی وڵاتانی ئەوروپادا، چەندین مەحفەل دامەزران، بۆ هەر مەحفەلێکی سەرەکی چەند مەحفەلێکی ئاسایی دانران، کە مەحفەلە سەرەکییەکان بە ناوی (المحفل الأكبر) یان (المحفل الاعظم) ناوزەد دەکران، دوای سەرهەڵدانی مەحفەلی ئینگلیزی وەك یەکەم کرانەوە، چەندین مەحفەلی دیکە لەوڵاتانی ئەوروپا کرانەوە وەك:

- مەحفەلی پاریس، ساڵی (١٧٢٥)،
- مەحفەلی مەزن لە ئیرلەندا، ساڵی (١٧٣١).
- مەحفەلەکانی ئەمریکا و هیند و بەنغال و جەبەل تاریق، لە ساڵی(١٧٣١).
- مەحفەلی هامبۆرگ، ساڵی (١٧٣٣).
- مەحفەلەکانی سویسرا هۆڵەندا، ساڵی (١٧٤٠).
- مەحفەلی بوترسبۆرگ، ساڵی (١٧٥٠).
- مەحفەلی بیلۆڕوسیا، ساڵی (١٧٧٠).
- مەحفەلی ڕوسی مەزن، ساڵی (١٧٧٢).

- مەحفەلی سوید، ساڵی (١٧٧٣).
- مەحفەلی ئیتاڵیا، ساڵی (١٧٧٤).

بێگومان سەرەتا هەموو ئەم مەحفەلانە لە ژێر چاودێری مەحفەلی بەریتانیای مەزن دامەزران، دواتریش مەحفەل لە زۆربەی وڵاتانی دونیای عەرەبی و ئیسلامیشدا کرانەوە، ئەمەش هاوتەریب بوو لە گەڵ گەشەکردنی ماسۆنییەت لە نێو زۆربەی وڵات و گەلانی جیهاندا.

سەبارەت بە ژمارەی مەحفەلەکانیش، ئەوا زانیاری جودا جودا هەن لە قۆناغە جیا جیاکاندا، بۆ نموونە بەپێی ئاماری ساڵی (١٩٦٤)ی (دائرة المعارف الدولية) ژمارەی تەواوی مەحفەلەکانی ماسۆنییەت لە جیهاندا بریتیی بووە لە (٣٢٠٠٠)هەزار مەحفەل.

لە کتێبی (السر المصون)دا هاتووە: بە پێی لیستێك کە لە ساڵی(١٩٠٧)دا ئامادەکراوە، ئەویش لەسەر زاری یەکێك لە ڕێبەرە گەورەکانی ماسۆنییەتەوە وەرگیراوە و دەڵێت: لە جیهاندا (١٠٦) ئیالەی ماسۆنییەت هەیە، کە لە ئەورووپا (٢٤) ئیالە و لە ئەمریکای باکور (٥٢) ئیالە و لە ئەمریکای باشور (٢١) ئیالە و لە ئوستراليا (٧) ئیالە و لە ئەمریکا (٢)...هتاد. ئەمەش پوختەی ناوی ئیالە و ژمارەی مەحفەلەکانە لەو سەردەمەدا:

| ولآت | مەحفەلەکان |
| --- | --- |
| ئیالەی ئینگلتەرا | ٢٦٠٠ |
| ئیالەی ئیسکۆتلەندا | ١٠٠٠ |
| ئیالەی ئیرلەندا | ٤٥٠ |
| ئیالەی فەرەنسا (شرق فرنسا الاعظم) | ٤٠٠ |
| ئیالەی فەرەنسا (الاسکوتلندیة) | ٨١ |
| ئیالەی ئیتاڵیا | ١٩٥ |
| ئیالەی بەرلین | ١٣٧ |
| ئیالەی (برلین الملکیة) | ٦٩ |
| ئیالەی ئەڵمانیا | ١٢٨ |
| ئیالەی ئیسپانیا | ٥٩ |
| ئیالەی ئسوج | ٣٥ |
| ئیالەی ئەمریکای باکور | ١٠٠٠ |
| ئیالەی ئوسترالیا | ٧٠٠ |
| ئیالەی ئەمریکای ناوەڕاست و باشور | ٥٥٠ |

کەسێکی وەك (الاب لویس شیخو) پێی وایە، ماسۆنیزم بە زۆری ئەو ولآتانەدا گەشە دەکات، کە لە ڕووی ڕێباز و باوەڕەوە سەر بە مەزهەبی پرۆتستانتین, هەروەها دەڵێت پرەنسیپەکانی ئەم ڕێباز و باوەڕە زەمینە خۆشکەرن و لەسەر بنەمای سەربەستین و کەشێکی لەبار دەرەخسێنی بۆ گەشەکردنی هەموو بیرو باوەڕێکی تر، وەك دەبینرێت ئەمە لەو ولآتانەدا کە

هەڵگری ڕێباز و باوەڕی کاسۆلیکین، کەمتر بواری گەشە کردنیان هەیە.

سەبارەت بە دامەزراندنی یەکەم مەحفەلیش لە وڵاتانی عەرەبیدا، ئەوا مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٧٩٨). لەم بارەوە هاتووە: بە فەرمانە (ناپلیۆن بۆناپەرت) کە یەکێك بووە لە ماسۆنییە گەورەکانی فەرەنسا، دوای پەلاماردانی وڵاتی میسر، جەنەراڵ (کلیبەر) و ئەوانەی لە گەڵیدا بوونە پاسپاردوون بۆ دامەزراندنی یەکەم مەحفەلی ماسۆنی لە میسر، ئەمەش لە ساڵی (١٧٩٨) بووە بە ناوی (محفل ایزیس) کە پەیوەست بووە بە (الشرق الاعظم الفرنسي) و بارەگاکەی لەقاهیرە بووە، هەر لە درێژەی زانیاریەکانیدا لە بارەی کردنەوەی مەحفەلی ماسۆنی لە وڵاتانی عەرەبیدا هاتووە: یەکەم مەحفەلی ماسۆنی لە لوبنان دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٨٦٢) لە ژێر چاودێری (الشرق الاعظم الانكليزي)دا بووە، بە ناوی (محفل فلسطين) کە بارەگاکەی لە بەیروت بووە و دواتر لە ساڵی (١٨١٨) ئەم مەحفەلە لەکارەکانی وەستاوە و پاشان لە هەمان وڵاتدا مەحفەلێکی تر بە ناوی (محفل لبنان) دامەزراوە لە ژێر چاودێری (الشرق الاعظم الفرنسي) کە ژمارەیەك لە ماسۆنییە فەڵەستینیەکان پەیوەندییان پێوە کردووە.

بە پێی زانیاریشمان یەکەم مەحفەلی ماسۆنی لە عێراقدا، مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٩١٨) دوای داگیرکردنی وڵاتەکە لە لایەن کۆلونیالیزمی ئینگلیزەوە.

هەرچەندە ئینگلتەرا سەرەتا پێگەی دروستبوونی یەکەم مەحفەل بووە، بەڵام ئێستا ئەمریکا لە پلەی یەکەمدایە و زیاتر لە (١٥) هەزار مەحفەلی هەیە، بۆ نموونە تەنها لە شاری (نیۆیورك) نزیکەی هەزار مەحفەل بوونیان هەیە و ئەمڕۆ ئەمریکا گەورەترین ناوەندی گرنگ و فراوانە بۆ ماسۆنیزم.

# ژمارەی ئەندامانی ئەم کۆمەڵەیە

کەم و زۆری و پێشکەشکردنی زانیاری و داتای جۆراوجۆر لە سەرچاوە جیاجیاکانەوە، کەشێکی وای ڕەخساندووە، مەسەلەی ژمارەی ئەندامانی ئەم کۆمەڵەیە لە جیهاندا وەك پێویست نەزانراو بێت، وەك تەماشا دەکرێت هەندێك بە ئەنقەست ژمارەکەیان زۆر زیاد پیشانداوە، یان بە کەمی خەملاندوویانە، کەسانێکی تریش نازانستیانە چەندین ژمارەی جیاجیا و قەبەیان خستۆتە ڕوو، لەڕاستیدا بابەتەکەی گوماناوی کردووە و مرۆڤ ناتوانێت لە ڕووی زانستی و ئەکادیمییەوە پشتی پێی ببەستێت، بەش بە حاڵی خۆم گومانم لە زۆربەی ئەو ئامار و داتایانە هەیە کە لەو بارەوە خراونەتە ڕوو، هەرچی ڕێبەر و هەوادارانی ئەم کۆمەڵەیە هەیە زۆربەی تایبەتمەندییەکانیان بە نهێنی و شاراوەیی هێشتۆتەوە، وەلێ نەیار و بەرەی دژە ماسۆنییەتیش هەندێکجار لە ژێر گوشاری سۆز و خەیاڵدا گەلەك ئاماری خەیاڵی و نالۆژیکیان خستۆتە بەردەست، بێشك گومان لە ڕاستی و دروستی دەکرێت، بۆیە هەموو ئەم ڕاستییانە وای کردووە بابەتی دەستنیشانکردن و زانینی ژمارەیەکی ڕاست و دروستی کۆی ئەندامانی ئەم کۆمەڵەیە لێڵ و نادیاربێت.

هەرچۆنێك بێت، ئێمە وەك پێویستییەك هەندێك لەو داتا و ئامارانە دەخەینە ڕوو کە تا هەنووکە سەرچاوەکان باسیان لێوە

کردووە، بەو ئامانجەی ئەگەر بە شێوەیەکی ڕێژەییش بێت وێنەیەکی هاکەزایشمان لەلا دروست بێت بۆ نزیکی ئاست و قەبارەی ئەندامانی ئەم کۆمەڵەیە هەرچەندە بۆ خۆم بەد گومانم لە ئێستا و ئایندەدا ژمارەیەکی تەندروستمان وەچنگ کەوێت، ئەمەشیان لە بەر گەلەك فاکتەر کە پێشتر لە بارەیەوە دواوین.

وەك لە کتێبەکەی (الاب لویس شیخو)دا هاتووە و بەپێی ئامارێکی ساڵی (١٩٠٧) ئاماری ژمارەی ئەندامانی کۆمەڵەی ماسۆنییەت لە زۆربەی مەحفەلەکاندا بەم شێوەیە بووە:

| ئیالەکان | ژمارەی ماسۆنی |
|---|---|
| ئیالەی ئینگلتەرا | ١٣٠٠٠٠ |
| ئیالەی ئوسکۆتلەندا | ٥٠٠٠ |
| ئیالەی ئیرلەندا | ١٥٠٠٠ |
| ئیالەی فەڕەنسا(شرق فرنسا الاعظم) | ٢٧٠٠٠ |
| ئیالەی فەڕەنسا(فرنسة الاسکوتلندیة) | ٥٠٠٠ |
| ئیالەی ئیتالیا | ٢٠٠٠٠ |
| ئیالەی بەرلین | ١٥٠٠٠ |
| ئیالەی(برلین الملکیة) | ٧٠٠٠ |
| ئیالەی ئەڵمانیا | ١٣٠٠٠ |
| ئیالەی ئیسپانیا | ٢٥٠٠ |
| ئیالەی(سوج) | ١٢٠٠٠ |

| | |
|---|---|
| ئیالەی ئەمریکای باکور | ١٠٠٠٠٠٠ |
| ئیالەی ئوستralیا | ٣٠٠٠٠ |
| ئیالەی ئەمریکای ناوەڕاستو باشور | ١٠٠٠٠٠ |

لە داتایەکی تردا، سەبارەت بە ڕێژەی ئەندامانی ماسۆنی تەنها لە ولاٌتە یەککگرتووەکانی ئەمریکادا هاتووە؛ ژمارەی ئەندامانی ماسۆنی لە ئەمریکادا نزیکەی لە (٣٪)ی ڕێژەی دانیشتوانی ئەو ولاٌتە پێکدێنی بو نموونە تەنها لە شاری (نیۆیورك) نزیکەی (٣٥٠٠٠٠)هەزار ئەندامی ماسۆنی هەیە.

هەروەها بە پێی ئامارێك لە ساڵی (١٩١٠) کە لە کتێبی (السر المصون) وەرگیراوە، کۆی ژمارەی ئەندامانی ماسۆنی لەو سەردەمەدا بریتی بووە لە (١٧٤٤٨٧٨)ماسۆنی کە بەم شێوەیەی لای خوارەوە دابەش بوونە بە سەر ولاٌتاندا.

| ولاٌت | ژمارەی ئەندام |
|---|---|
| ئینگلتەرا | ١٥٢٥٥٠ |
| سکۆتلەندا | ٥٠٠٠٠ |
| ئیرلەندا | ١٨٠٠٠ |
| ئەلمانیا | ٥٤٠٠٠ |
| فەرەنسا | ٣٦٠٠٠ |
| ئیتالیا | ١٥٠٠٠ |
| پورتوگال | ٢٨٨٧ |
| هولەندا | ٤٦٠٠ |

| | |
|---|---|
| ئیسپانیا | ٣١٦٠ |
| سویسرا | ٣٦٤٦ |
| بەلجیکا | ٧٠٠ |
| یۆنان | ٤٩٥٠ |
| ڕۆمانیا | ٢٢٥ |
| ئەمریکای باکور | ١٢٧٥٩٣٠ |
| ئەمریکای ناوەڕاست | ٨٢٠٦ |
| ئەمریکای باشور | ٣٧٣٩٤ |
| ئوسترالیا | ٤٠٧٢٩ |
| مەجەر | ٥١٣٢ |
| ئەسوج ونەرویج | ١٦٧٣٣ |
| دانیمارك | ٥١٣٢ |
| تورکیا و ئەفریقیا و ئاسیا | ٢٠٠٠٠ |

بە پێی داتاکانی (دائرة المعارف الدولیة) لە ساڵی (١٩٦٤) کۆی ژمارەی ئەندامانی ماسۆنی بە (پێنج تا شەش ملیۆن) ماسۆنی خەملاندووە. هەرچەندە ئەم ئامارە تێڕامانێکی ڕێژەییە و هەرگیز ناکرێت وەك داتایەکی دروست و سەت دەر سەت تەماشا بکرێت.

هەر سەبارەت بە قەبارەی ئەم کۆمەڵەیە لە ڕووی چەندایەتییەوە لە هەموو جیهاندا هاتووە: لە هەشتاکاندا (مەبەست هەشتاکانی سەدەی بیستەمە) ژمارەی ماسۆنییەکانی جیهان

نزیکەی (٦) ملیۆن ئەندام بووە و بەم شێوەیە بەسەر ولآتاندا بلآویونەتەوە:

- چوار ملیۆن ماسۆنی لە ئەمریکا،
- یەك ملیۆن ماسۆنی لە بەریتانیا،
- یەك ملیۆن ماسۆنی لە تەواوی ولآتانی تری جیهان، بە ولآتانی عەرەبی وتەنانەت ئیسرائیلیشەوە،

تا ئێرە ئێمە ئامارێکی نوێمان وەچنگ نەکەوت، لە ڕاستیدا بۆ ئەم بابەتە وا بەسەر پێی ناتوانین پشت بە ئامارێکی سەت دەر سەت ببەستین، ئەمەش وەك وتمان لەبەر چەندین فاکتەری خودی و بابەتی. وەك لە ئامارەکانی سەرەوەدا هاتووە، دەبینین لە کۆی هەموویان ئەمریکا بە پلەی یەکەم دێت و بەریتانیا بە پلەی دووەم و ئینجا تەواوی ولآتانی تری دونیا پێکەوە بە پلەی سێهەم دێن.

## یانەکانی ڕۆتاری (نوادی الروتاري)

ماسۆنییەت وەك هەر كۆمەڵەیەكی تر، یەكێك لە ئامانجەكانی كۆكردنەوەی زۆرترین ئەندام و هەواداربووە، بۆیە چەندین شێواز و دەروازەی جۆراوجۆری بەكارهێناوە بۆ ئەو مەبەستە، بە تایبەتی چۆنێتی كۆكردنەوەی ئەندام لە نێو كەسانی بڕیار بەدەست و بازرگان و سیاسەتوان و ڕوناكبیران، بۆ ئەمەش پێویستی بە چەندین ئامراز و ئەلتەرناتیڤ هەبووە لە دەرەوەی مەحفەلەكانی ماسۆنییەت.

هەر بۆیە لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە یانەیەكی نێودەوڵەتی لە ژێر ناوی (الروتاری) دامەزراند هەرچەندە لە دیاری كردنی مێژووی دامەزراندنی ئەم یانەیەدا جیاوازییەكی زۆر هەیە و هەمووان لەسەر یەك مێژوو كۆك نین، بۆ نموونە هەندێكیان پێیان وایە لە ساڵی (١٩٠٥) لە شاری (شیكاگۆ) لە وڵاتە یەككگرتووەكانی ئەمریكا دامەزراوە، كۆمەڵێكی تریش پێیان وایە لە ساڵی (١٩٠٤) دامەزراوە ، هەرچەندە زۆربەی سەرچاوەكان كۆكن لەسەر ئەوەی یانەی ڕۆتاریی لە ساڵی (١٩٠٤) لە شاری شیكاگۆ و لەسەر دەستی پارێزەر (بول هاریس) دامەزراوە، هەرچۆنێك بێت پێم وانییە ساڵێك

کەم یان زیاتر بۆ دەستنیشانکردنی ئەم مێژووە گرفتێکی ئەوتۆ دروست بکات.

بە کورتی ئەم یانەیە بریتییە لە یەکێك لە دەزگاکانی ماسۆنیزم، بەلاّم لە ژێر ناو و پەردەی جیاجیادا، کە ئامانجە هەرە سەرەکییەکەی خزمەت گەیاندن بووە بەم کۆمەلّەیە.

بەزۆری ئەندامانی ئەم یانەیە بریتین لە پیاوانی خاوەن کار و بازرگان و فەرمانبەر و پزیشك و ئەندازیار و سیاسەتوان، ئەوەش کە باوە کات و شوێنی کفتوگۆ و یەك بینینی ئەندامانی ئەم یانەیە لەسەر سفرەی نانخواردن بووە، کەواتا لە کاتی نانخواردندا دیالۆگ و مشتومڕ و بیروڕایان لەسەر بابەتەکان گۆڕیوەتەوە، هەروەها یاساکانیشیان وابووە هەر لەوێدا حالّەتی پەك ناسین لە نێوان ئەندامە کۆن و نوێکاندا ڕوویداوە و بە یەکتر ئاشنا بوونە، بۆ هەر کۆبونەوەیەکیش لە هەفتەدا ڕۆژێك تەرخان دەکرا.

یانەی ڕۆتاری لە سەر بنەمایەکی ڕێکخراو بۆ هەر دەولّەتێك بوونی هەیە، بۆ هەر سالّێکیش کەسێك دەکرێتە (پارێزگار) بۆ ناوچەیەکی جوگرافی و بۆ هەر ناوچەیەکیش ژمارەیەکی تایبەتی هەیە، کەواتا ڕێکخراوی ڕۆتاری ئێستا پێکهاتووە لە (٣٥٠) ناوچە کە بە شێوەیەکی نەزانراو و شاراوە بەسەر ولاّتانی جیهاندا دابەشبووە.

سەبارەت بەم یانەیە هاتووە: دوای ئەوەی بوونی ماسۆنییەت ئاشکرا بوو، زایۆنیزم کەوتە هەلّپەی دانانی نەخشەیەکی نوێ وەك

ئەلتەرناتیڤ بۆ ماسۆنییەت بە مەبەستی بەجیهێنانی ئامانج و پێویستییەکانی جولەکە لەفەلەستین و جیهاندا.

هەر هەمان سەرچاوە دەڵێت: یەکەمجار نە بەناوی (الروتاری) و دووەم جاریش نە بەناوی (الليونز)ەوە ئەم جۆرە یانانە سەریان هەڵدا، هەرچی ووشەی (الروتاری) هەیە بە مانای گەڕانەوە دێت، ، کەواتا گەڕانەوە بۆ فەلەستین و پێکهێنانی مەملەکەتی (یهوذا) کە حکومی جیهان بکات.

وەك زانراوە لە ئەندامە بە ناوبانگەکانی ئەم یانەیە (اورخان کورلتان) کە کوڕی هاوڕی (کورلتان)ی سەرۆکی پەرلەمانی تورکیا بووە لەساڵی (۱۹۲۰) هەروەها لە ئەندامە دیارەکانی ملیۆنێر (کوزاد هیلتون)ی جولەکەیە، کە خاوەنی کۆمەڵەی هۆتیلەکانی (هیلتون)ە کە لە جیهان دا بڵاوبوەتەوە، ئەم ئۆتێلانە، کاریگەری گەورەیان هەیە بۆ کۆنترۆڵکردنی ئابوری وڵاتان.

ئەوانەی کە بە زۆری دەبنە ئەندامی ئەم یانەیە بریتین لە سیاسەتمەدار و دەوڵەمەندە پلە دووەکان، کە هەندێکیان کۆنترۆڵی بانك و بازاڕە بازرگانییە گەورەکانیان کردووە، بە تایبەتی ئینگلیزەکان، چوونکە ژمارەیەك لە (لوردات)ی پەرلەمانی بەریتانیا ڕۆڵی گەورەیان هەیە لەم بوارەدا.

لە ساڵی (۱۹۱۱) بیرۆکەی ڕۆتاری لە ئەمریکاوە گوازراوەتەوە بۆ ئینگلتەرا و پاشان بۆ زۆربەی وڵاتانی دونیا، تاکو لە ساڵی (۱۹۲۱) بڕیاری دامەزراندنی (یانەی رۆتاری نێودەوڵەتی) درا وەك

هەوڵێك بۆ یەكخستنەوەی كارەكانی ڕۆتاری. دەكرێ لای خوارەوە هەندێك ئاماری سەرەتایی، ئەگەرچی نوێ نین بیخەینە بەر دەستی خوێنەر بە ئامانجی دروستكردنی وێنەیەك لە سەر ژمارەی ئەندامانی ئەم یانەیە، بێگومان زانیارییەكانیش لە كتێبی (النشاط الصهیوني الماسوني في الوطن العربي)یەوە وەرگیراوە و هاتووە:

- تاكو جەنگی جیهانی دووەم ژمارەی ئەندامانی ئەم یانەیە بریتیی بووە لە نزیكەی (٢١) هەزار ئەندام كە بە سەر (٦٠) وڵات دابەشبووبوون.
- لە ئێستادا (مەبەست لە هەشتاكانی سەدەی بیستەم)ە، چالاكییەكانی ئەم یانەیە گەیشتۆتە (١٤٠) وڵات، كە پێكهاتبوو لە (١٧)هەزار یانە، كۆی ژمارەی ئەندامەكانی زیاتر لە (٨٠٠) هەزار ئەندام بووە.

هەروەها ناوەندی سەرەكی سەرپەرشتیكردنی ئەم یانانە لە هەموو جیهاندا لە شاری (افنستون) بووە لە ویلایەتی (الینوی) لە وڵاتە یەككگرتووەكانی ئەمریكا.

# ماسۆنییەت لە جیهاندا

ماسۆنیزم وەك مێژوو، وەك بیرۆکە، وەك جوڵانەوەیەکی نهێنی، پڕە لە کاری شاراوە، بە تایبەتی دوای ئەوەی بە شێوە هاوچەرخەکەی لە ئەوروپادا و بەرێکی لە ئینگلتەرا سەری هەڵدایەوە، وردە وردە لە وڵاتانی ئەوروپا و پاشان ئەمریکا و هەروەها وڵاتانی ڕۆژهەڵاتدا گەشەیەکی فراوانی بەخۆیەوە بینی و لە زۆربەی وڵاتاندا گەرای خۆی دانا، تاکو بووە خاوەنی چەندین ملیۆن ئەندام و سەدان هەزار مەحفەل لە تێکڕای جیهاندا.

لێرەدا پێویست دەکات بە کورتی ئاماژە بۆ پرۆسەی سەرهەڵدان و گەشەکردنی ماسۆنیزم بدەین لە هەندێك وڵات:

## ئینگلتەرا

وەك پێشتر ئاماژەمان بۆی کرد ئەم وڵاتە دووەم ژینگەی سەرهەڵدانەوەی ماسۆنیزمە، بەڵام بە شێوە هاوچەرخەکەی، لە ساڵی (١٧١٦) بە هەوڵ و کۆششی (لاڤ) و کوڕەکەی و زاواکەی لەسەر ڕەگ و ڕیشەی بنەما تایبەتەکانی هێزی شاراوە و بە هاوکاری هەر یەك لە (دیزا کولییە) و (جۆرج) پێکەوە بڕیاری زیندوکردنەوەی ئەو کەلتور و ئامانجە بدەن، کە لە مێژوودا هێزی شاراوە کاریان بۆ دەکرد، بەڵام ئەمجارەیان لە ژێر ناوی (فرانما سونیری) بنیاتنەرانی

ئازاد، بە فۆرم و سیاسەتێکی نوێ و جیاوازترەوە، بۆیە لەساڵی (١٧١٧) ئەم خواستە دێننە جێ و بڕیاری دامەزراندنی ئەم کۆمەڵەیە دەدەن و یەکەم مەحفەلیش بە ناوی (محفل انکلترا الاعظم) دادەمەزرێنن.

پاشان ماسۆنییەت شێوەیەکی زیاتر ڕێکخراوەیی بە خۆیە دەبینی، تا وای لێی دێت پەیڕەوی ناوخۆ لە ساڵی (١٧٢٧) لەسەر دەستی دکتۆر(جیمس اندرسون) بۆ خۆی دادەنێت. بە پێی ئامارێکی ساڵی (١٩١٠) ژمارەی مەحفەلەکانی وڵاتی ئینگلتەرا بریتی بووە لە (٢٨٠٠) مەحفەل، کە ژمارەی ئەندامەکانی (١٥٢٥٥٠) هەزار کەس بووە. هەروەها لە هەمان سەرچاوەدا ئامارێکی ساڵی (١٩٠٧) هاتووە: لە ئینگلتەرا ژمارەی مەحفەلەکان (٢٦٠٠) مەحفەلن و زیاتر لە (١٣٠٠٠٠) هەزار ئەندام لە خۆ دەگرێت. بێگومان لە ئامارە نوێکاندا ئەم ژمارەیە زۆر زیاترە، هەرچەندە هەنووکە ئامارێکی زۆر نوێ لەبەر دەستماندا نییە، لێرەوە ئیدی ئەم وڵاتە دەبێتە یەکەم لانکەی لە دایکبوونی ماسۆنییەت بە شێوە هاوچەرخەکەیەوە، هەر لێرەشەوە پەل دەهاوێت بۆ وڵاتانی دونیا.

### ئەمریکا

بەشێکی زۆر لە ژێدەرەکان جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە، مێژوویەکی دیاریکراو دەستنیشان نەکراوە یان نییە بۆ پەیدابوونی

ماسۆنیزم لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، سەرباری بڵاوبونەوەی بە شێوەیەکی خێرا و بەرفراوان.

بەهۆی دروشم و ئامانجە ڕاگەیەنراوەکانی ماسۆنیزمەوە، دەبینرێت ئەم کۆمەڵەیە پێگەیەکی گەورەی بۆ خۆی دروست کردووە، هەروەها بە چاوێکی گەورە و پڕ لە سۆزەوە لە ئەمریکا تەماشا دەکرا، چونکە بانگەشەکانی ماسۆنیزم بۆ خزمەتکردنی مرۆڤایەتی و بەخشندەیی و پێشکەشکردنی هاریکاری بە ئەندامەکانی، وای کرد لە دەرفەتێکی کەمدا ژمارەیەکی زۆر ئەندام لە دەوری کۆببێتەوە، هەر ئەم پێگەیە وای کردووە کەسە دیارەکانی ئەمریکا شانازی بەوەوە بکەن کە ئەندامی ئەم کۆمەڵەیەن.

ڕۆڵی ئایین و پیاوانی مەسیحیەت لەم بوارەدا بۆ سەر دوو گروپی دژ بەیەك دابەش بووبوون، بۆ نموونە هەرچی هەوادارانی بیرو باوەڕی پرۆتستانتی هەبووە بە ئاشکرا پشتیوانیان لە ماسۆنیزم دەکرد، ئەوەتا لە مانگی شوباتی ساڵی (١٩٤٥)دا زیاتر لە (٥٠٠) هەزار قەسیس نامەیەك ئاڕاستەی کۆنگرێس و حکومەتی ئەمریکا دەکەن و تێیدا داوا دەکەن دەرگاکانی فەڵەستین والاّ بکرێن لەبەردەم کۆچکردنی جولەکە بۆ ئەو خاکە، بەمەبەستی دامەزراندنی نیشتمانێکی نەتەوەیی بۆ خۆیان.

ئەمە هەوڵێکی ڕوونە لەلایەن ڕێباز و باوەڕێکی گەورە و کاریگەری ئەو وڵاتەوە بۆ پشتگیرکردنی لە پرۆژە ستراتیژیەکانی

جولەکە، کەچی دەبینین لە بەرانبەردا هاولاتییە ئەمریکاییەکانی هەلگری ڕێباز و باوەڕی کاسۆلیکی بۆچوونی دژیان هەیە و زۆر بە ئاشکرا دژایەتی خۆیان بۆ ڕێباز و بەرنامەکانی ماسۆنیزم دەربڕیوە، تەنانەت بانگەشەیان بۆ ئەوە کردووە ئەم کۆمەڵەیە لە ئەمریکادا یاساغ بکرێت، چونکە مەترسییە بۆ سەر ئاین و بیرو باوەڕەکان.

ماسۆنییەت بە شێوەیەکی وا گەشە و فراوانی بە خۆیەوە بینی، تەنانەت بەشێکی زۆر لە بەرپرسە بالأکانی ئەمریکا لە سەرۆك کۆمار و وەزیر و کۆنگرێسمان و نوسەر و ڕوناکبیرو گەورە بازرگان بوونە ئەندامی، ئەمەش لە قۆناغە جیاجیاکاندا، هەروەها بە فەرمانی ڕێبەرانی ماسۆنیزم چەندین یانە و ڕێکخراوی جۆراوجۆر دروستکران، بەلأم لە ژێر ناوی جیاجیادا، بۆ نموونە شێوازی پەیوەندیکردنی زەنجییەکان (الزنوج) لەهی ئەوانی تر جیاواز بووە و گەلەك ڕێکخراوی تایبەتیان لەو بوارەدا بۆ خۆیان دامەزراند لە وێنەی ڕێکخراوی (البرنس هال) کە لە ساڵی (١٧٩١) لە (بوسگن) دامەزرا.

هەروەها دروستبوونی کۆمەڵەی (بنای بريت) کە لە ساڵی (١٨٤٣) دامەزرا، کە ئامانجی سەرەکی بەرزکردنەوەی ماف و داخوازی و گەورەیی جولەکە بووە لە ئاستی جیهاندا، مەحفەلەکانی ماسۆنیزم وەك چۆن لە ئەوروپا کار دەکەن ئاوەهاش ژمارەیەکیان بە ئاشکرا و هەشیانە بە نهێنی لە ئەمریکا کار دەکەن، سەرچاوەکان تا ڕادەیەك کۆك نین لەسەر ئەوەی دامەزراندنی یەکەم مەحفەل لەئەمریکا دەگەڕێتەوە بۆ کەی، سەبارەت بە ژمارەی مەحفەل و

ئەندامانی ئەم کۆمەڵەیە، چەندین ئامار لە بەر دەستدان، کە بەشی زۆریان ئاماری تازە نین، بۆ نموونە زۆریك لە ئامارەکان ژمارەی ئەندامەکانی لەم وڵاتەدا بە (٤) ملیۆن خەملاندووە، کە بە سەر و (١٦) هەزار مەحفەلدا دابەشبوونە. لە ئامارێکی تردا هاتووە: ژمارەی ئەندامانی ماسۆنی لە وڵاتە یەککگرتوەکانی ئەمریکادا لە (٣٪) کۆی دانیشتوانی ئەو وڵاتە پێکدێنی.

کەواتا ئەمڕۆ ئەمریکا گەورەترین وڵات و ناوەندە، پێگە و قورسایی ماسۆنیزم چ لە ڕووی چەندایەتییەوە، چ لە ڕووی چۆنایەتییەوە لە بەرزترین ئاست و قەبارەدایە و تەنانەت کاریگەریشی لە هی ئەوانی تر زیاترە، زۆرێك لە چاودێران ئەو هەموو پاڵپشتی و هاوکارییە جۆراو جۆرانەی ئەمریکا بۆ ئیسرائیل بە گوشار و بەرنامەی کۆمەڵەی ماسۆنییەت دێتە ئەژماردن.

## کۆماری میسڕ

میسڕ وڵاتێکی گەورە و گرنگی جیهانی عەرەبی و ئیسلامییە و هەمیشە خۆی بە خاوەن پێگە و دەسەلآت دەزانێت لە کاتی ڕوداوەکاندا، ئەم ڕاستیەش لای هەموو دونیا ڕوونە چوونکە هەر هیچ نەبێت ئەم وڵاتە لای عەرەب سەنگ و قورسایی خۆی هەیە لە هاوکێشەکان و حیسابی تایبەتیش بۆ سەنگ و هەڵویستەکانی دەکرێت لە مەڕ کێشەکانی عەرەب و جیهانی ئیسلامیدا.

بێشك مێژووی سەرهەڵدان یان پەیدابوونی ماسۆنیزم لەم وڵاتەدا بەستراوەتەوە بە مێژووی پەلاماری زلهێزەکان بۆ سەر ناوچەکە، کەواتا ماسۆنیزم و کردنەوەی مەحفەلەکانی هاوتەریبن لە گەڵ هاتنی هێزە داگیرکەرەکان بۆ سەر ئەو وڵاتە، نەك هەر سەرهەڵدانی ئەم دیاردەیە بەڵکو چەکەرەکردنی گۆڕانە سیاسی و ئابوری و رۆشنبیرییەکان لە میسرِ هاوجووتە لەگەڵ پرۆسەی داگیرکاری بۆ سەر میسرِ و ناوچەکە.

میسرِ پێش وڵاتانی تری عەرەبی، لە کۆتایی سەدەی هەژدەدا کەوتە بەر پەلاماری ئیستعماری ئەورووپی، کە بە شاڵاوەکانی (ناپلیۆن) دەستی پێکرد، ئەمەش سەرەتایەك بووە بۆ دروستبوونی مەحفەلی ماسونی، چوونکە وەك زانراوە خودی ناپلیۆن یەکێك بووە لە ماسۆنییە گەورەکانی فەرەنسا.

لەم بارەوە هاتووە: ناپلیۆن فەرمان دەدا بە جەنەراڵ (کلیپەر) و ئەوانەی لەگەڵی دەبن، هەستن بە دامەزراندنی یەکەم مەحفەلی ماسۆنی لە میسرِ، ئەمەش بەڕێکی لە ساڵی (١٧٩٨) زایینی بووە، بە ناوی (محفل ایزیس) کە سەر بە (الشرق الاعظم الفرنسي) بووە. بەڵام لەبەر ئەوەی سەرجەم دامەزرێنەرانی ئەم مەحفەلە بریتی بوونە لەخەڵکی بێگانە، نەیتوانیوە سەرکەوتن بەدەست بێنی، بۆیە لەکار دەکەوێت، تەنانەت دامەزرێنەرە سەرەکیەکەشی لە ساڵی (١٨٠٠)زایینی دەکوژرێت، زانیاریەکانیش باس لەوە دەکەن ناوبراو

لەسەر دەستی گەورە شێخی ئەزهەر (الشيخ سليمان الحلبي) کوژراوە.

لە ساڵی (١٨٣٠) وەفدێکی ماسۆنی ڕەوانەی میسر دەکرێت، تاکو لە (الاسكندرية) بە شێوەیەکی نهێنی مەحفەلێك دروست بکەن، ئەمەش وردە وردە دەبێتە هەنگاوێك بۆ گەشەکردنیان و زیاتر چالاك دەبن، هەروەها لە ساڵی (١٨٤٥) سەموئیل جەنس کۆمەڵێك هاوکاری دەنێرێت بۆ ماسۆنییەکانی قاهیرە، ئەوانیش لە ژێر چاودێری (المحفل الاعظم الممفيسي) فەڕەنسادا مەحفەلێك لە قاهیرە دروست دەکەن، پاشان مەحفەلێکی تر لە شاری (الاسكندرية) بە ناوی (محفل الاهرام) دروست دەکەن، کۆمەڵێك کەسایەتی زۆر لە هەموو تائیفەکان لە دەوری کۆ دەبنەوە.

شارەزایان پێیان وایە مەحفەلی (الاهرام) ڕۆڵێکی گەورەی بینیوە لە بڵاوکردنەوەی ماسۆنییەتدا لە میسر، توانیویانە چەندین کەسایەتی نیشتمانی دیاربکەن بە ئەندامی کۆمەڵەی ماسۆنی، بۆ نموونە (الامير حليم باشا بن محمد بن علي باشا) و(الامير عبدالقادر الجزائري) دواتریش چەندین مەحفەل و ناوەندی گەورە کرانەوە بەمەبەستی بڵاوبوونەوەی ماسۆنیزم لە تەواوی وڵاتدا، هەر بۆیە لە ساڵی (١٨٥٦) مەحفەلی ئەلممفیسی وەفدێك ڕەوانەی میسر دەکات و لە شاری (الاسكندرية) مەحفەلێکی گەورەی هەرێمایەتی دەکەنەوە، پاشان لە ساڵی (١٨٥٩) چەندین مەحفەلی تر و بە ناوی جیاجیاوە لە شارەکاندا دامەزران، هەروەها لە ساڵی (١٨٦٤)یش بۆ

یەکەمجار مەحفەلی ماسۆنی ئیتاڵی دامەزرێنرا لە شاری (الاسکندریة).

بۆیە تا دەهات ژمارەی مەحفەلەکانی ماسۆنی لەم وڵاتە عەرەبیەدا ڕووی لە زیادکردن بووە، ئەمەش کاریگەری خستەسەر کەسایەتییە دیارەکانی وڵات و چەندین کەسی وەك (الخدیوی اسماعیل باشا) پەیوەندی کردووە و بووە بە ئەندامی کارای ئەم کۆمەڵەیە و چەندانی تریش وەك جەماڵەدینی ئەفغانی و یوسف ئەلحاجیش بوونە ئەندامی کارا.

یەکەم ڕۆژنامەی ماسۆنی لە میسرِدا بریتیی بووە لە (جریدة النهضة الیهودیة) و پاشان ڕۆژنامەی (الحقیقة) کە لەلایەن جولەکەیەکی ماسۆنی بە ناوی (فرج حزرامي)یەوە دەردەکرا لە شاری(الاسکندریة) لە ساڵی (١٨٨٨). ئەم دوو ڕۆژنامەیە سەرجەم هەواڵ و چالاکی و پەیامەکانی ماسۆنیزمیان لە میسرِ بڵاودەکردەوە، ئەم دوو ڕۆژنامەیە وەك دوو زمانحاڵی ماسۆنیزم تەماشا دەکران، هەرچەندە دواتریش ڕۆژنامەیەکی تر بە ناوی (اللطائف)وە کە خاوەنەکەی ناوی (شاهین مکاریوس)بووە دەردەچوو و تاکو مردنی خاوەنەکەشی هەر بەردەوام بووە لە دەرچواندن ، کە هەر بۆ خۆشی ڕێبەرێکی دیاری کۆمەڵەی ماسۆنییەت بووە (٦٥).

لە ساڵی (١٩٠٠) ژمارەی مەحفەلەکانی ماسۆنی لە میسرِ گەیشتە (٢٩) مەحفەل، سەرەڕای بوونی چەندین مەحفەلی تر کە سەر بە وڵاتانی تر بوونە، تاکو لە ساڵی (١٩٦٤) چ بە ئاشکرا وچ بە

نهێنی ئەم مەحفەلانە کاری خۆیان کردووە، بەڵام لەم مێژووە بە دواوە حکومەتی میسر بڕیاری یاساغکردنی ئەم مەحفەلانەی دا.

لای خوارەوە بە کورتی تیشك دەخەینە سەر ناوی هەندێك لە مەحفەل و ژمارە و ناوی سەرۆکەکانیان!

| ژ | مەحفەل | شوێن | ژمارە | سەرۆك |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| ١ | ثمرة الأوفاء | القاهرة | ١١٢ | احمد حلمي روحي افندي |
| ٢ | حياة المحلة | المحلة الكبرى | ١٢١ | عبدالله وصفي افندي |
| ٣ | سليمان | الاسكندرية | ١٤٢ | جبرائيل شيبوب بط |
| ٤ | رفائة | القاهرة | ١٥٣ | قيصرغبربال افندي |
| ٥ | السعادة | القاهرة | ١٨٠ | |
| ٦ | نيو ممفيس | القاهرة | ١٨٦ | الميسو ايزاك شيزاثا |
| ٧ | ادريس | الاسكندرية | ١٩١ | تيوفل كاستر |
| ٨ | المجيد | القاهرة | ١٩٥ | محمد مراد افندي |
| ٩ | طريق الهدى | القاهرة | ٢٠٠ | محمد حسن الوكيل بط |

| ١٠ | خلاصة ثمرة العدل السعيد | القاهرة | ٢٠١ | محمد نشأت بط |
|---|---|---|---|---|
| ١١ | المروءة | القاهرة | ٢٠٣ | عطا فهمي افندي |
| ١٢ | صدق الوفاء | القاهرة | ٢٠٤ | محمد ربيع افندي |
| ١٣ | الاخلاص | القاهرة | ٢٠٥ | عبداللطيف خورشيد بط |
| ١٤ | الجمال | القاهرة | ١٠٧ | المسيو جميل كيابة |
| ١٥ | اسكندر الاعظم | القاهرة | ٢١٢ | المسيو دافيد ابشتين |
| | النظام | القاهرة | ٢١٦ | حميد شكري بط |
| ١٧ | فؤاد | القاهرة | ٢٢٠ | موسى مصلياح افندي |
| ١٨ | عباسي | القاهرة | ٢٢٣ | احمد فهمي عباس |

بێگومان ژمارەی مەحفەلەکانی کۆماری میسرِ زۆر لەمە زیاترە، وەڵێ ئێمە تەنها چەند نموونەیەکی کەممان هێنایەوە، باش وایە لە خوارەوەش ناوی هەندێك لەو مەحفەلانە بێنین کە بە پلەی باڵاَن و سەر بە (الشرق الاعظم الفرنسي) بوونە.

| ناوی مەحفەل | شوێنەکەی |
|---|---|
| محفل الاهرام | الاسكندرية |
| محفل دلف | الاسكندرية |
| محفل اوبردوك | الاسكندرية |
| محفل ايجيت(مصر) | الاسكندرية |
| محفل طيبة | القاهرة |
| محفل العدل | القاهرة |
| محفل اصحاب النجاح | القاهرة |
| محفل الشمس | القاهره |
| محفل مجمع البحرين | السويس |

ناوی ئەو مەحفەلانەی بە پلەی باڵا کاریان کردووە و سەر بە(المحفل الاعظم الانكليزي) بوونە:

| مەحفەل | شوێن | ژمارە | ساڵی دامەزراندن |
|---|---|---|---|
| ١. محفل البرت ادوارد | الاسكندرية | ١٢٩١ | ١٨٦٩ |
| ٢. محفل زتلاند | الاسكندرية | ١١٥٧ | ١٨٦٧ |
| ٣. محفل البلور | القاهرة | ١٠٦٨ | ١٨٦٥ |
| ٤. محفل كوكب الشرق | القاهرة | ١٣٥٥ | ١٨٧١ |
| ٥. محفل اليونان | القاهرة | ١١٠٥ | ١٨٧١ |
| ٦. محفل الكونكورديا | القاهرة | ١٢٢٦ | |
| ٧. محفل المارك | القاهرة | | |

٨. محفل الرويا وارس	القاهرة

٩. محفل القسطاط	القاهرة

١٠. محفل رعمسيس	الاسكندرية

١١. محفل اريوياح	الاسكندرية

**سوريا**

دەکرێ بڵێین سوریا سێهەم ولآتی عەرەبییە، کۆمەڵەی ماسۆنی تێدا بلآوبۆتەوە ئەویش لە ڕێگای مەحفەلەکانی لوبنان و میسرەوە، کەواتا ماسۆنییەت لە سەدەی نۆزدەدا لەم ولآتە بلآوبۆتەوە و زۆربەی مەحفەلەکانیش پەیوەست بوونە بە (الشرق الاعظم الايطالي) و (المحفل الانكليزي) و (الشرق الاعظم الفرنسي)یەوە.

چەندین مەحفەل لە شارەکانی (دمشق، حمص، حلب، انطاكية) دامەزران و ژمارەیەکی زۆر لە هاولآتیانی هەمە جۆری سوریای لە دەور کۆبوونەوە، لەم بارەوە (نعوم مكرزل) خاوەنی ڕۆژنامەی (الهدی) لە هەردوو ژمارەی (٢٤نیسان و١٧ئاياری ساڵی ١٩١١) وتویەتی: (بأن الماسونية السورية اضر واشرس هيئة عمومية اوجدها الجهل والتواطؤ، ففي الماسونية السورية نجد المجرم والمتشرد والبطال ومزور الحوالات والشهادات والجهل والمتعلم والمتعصب والمارق ورجل الدين والملحد والمقلق لراحة الناس والمخرب وادعياء الوطنية )، ناوبراو پێی وابووە ماسۆنییەت لە سوریا بۆ خۆی جەنگەڵستانێك بووە و پڕ بووە لەهەموو جۆرە مرۆڤێك، هەرچەندە

وای دەبینم ئەم دیدە برێك زیادەڕەویی تێدایە، لەبەر ئەوەی ئەوەندە ئێمە دیقەتمان دابێت ئەم کۆمەڵەیە خاوەن تەرزێکی تایبەت بووە بۆ وەرگرتنی ئەندام و بابەتی بە ئەندامبوون کارێکی ڕۆتین و هەروا سانا نەبووە ئەو هەموو پیاوکوژ و خەڵکە خراپ و گێرەشێوێنانەی کە ناوبراو باسی لێوە دەکات ئەندام بوبێتن، ئەمەش لە گەڵ سروشتی وەرگرتنی ئەندام لەم کۆمەڵەیەدا وەیەك نایەنەوە.

زۆربەی سەرچاوە و ژێدەرەکان، ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن ماسۆنیزم سەرەتا لەسەر دەستی کەسایەتی ناوداری عەرەبی ئەو سەردەمە (عبدالقادر الجزائري) لە سوریا بڵاوبۆتەوە، ئەمەش کاتێك بە ئاوارەیی لەو وڵاتە دەگیرسێتەوە، دەربارەی چۆنیەتی پەیوەندیکردنی ناوبراو بە ماسۆنییەتەوە هاتووە: لە (١٨حوزەیرانی ساڵی ١٨٦٤) لە کاتی گەڕاندنەوەیدا لە حیجاز، کە بۆ بەجێگەیاندنی ئەرکی (الحج) سەفەری کردبوو، بە شاری (الاسکندرية)دا تێپەڕ دەبێت، بۆیە پەیوەندی دەکات بە (محفل الاهرام)وە کە سەر بە (الشرق الاعظم الفرنسي) بووە، کاتێکیش دەگەڕێتەوە بۆ (دمشق) هەڵدەستێت بە دامەزراندنی مەحفەلێك کە سەر بە (المحفل الاکبر الایطالي) دەبێت لە ژێر ناوی (محفل سوريا) تا ماوەیەکیش ئەم مەحفەلە تاکە مەحفەلی ئەو وڵاتە دەبێت، چەندین جاریش نەوەکانی هەڵبژێردراون بۆ پلەی (الاستاذ الاعظم) دوای ئەمەش وردە وردە ماسۆنیزم زیاتر گەشە و پەرە دەسێنێت لە وڵاتی سوریادا.

هەرچەندە کۆمەڵێك لە سەرچاوەکان پێیان وایە ناوبراو بۆ ئەوە بووە بە ئەندام لەم کۆمەڵەیەدا، تاکو زانیاری تەواو لەسەر نهێنییەکانیان کۆبکاتەوە، گوایە کاتێکیش زانیاریەکانی وەچنگ کەوتووە، ئیتر وردە وردە لە کۆمەڵە و مەحفەلەکان دوور کەوتۆتەوە، بەڵام ناتوانرێت ئەم تێڕامانە بە هەند وەربگیرێت، چوونکە ناوبراو کەسی دیار و بنیاتنەر بووە لە دروستکردنی ئەم کۆمەڵەیەدا، دوای خۆشی نەوەکانی هەڵگری هەمان ڕێباز بوونە و پلەی ئوستادییان وەرگرتووە بۆیە لۆژیك نییە وا ببینرێت عەبدولقادر جەزائیری تەنها وەك کۆکەرەوەی زانیاری لە نێو ئەو کۆمەڵەیەدا کاری کردبێت.

زۆریك لە سەرچاوەکان بە توندی دژی کۆمەڵەی ماسۆنیزم لە سوریا قسەیان کردووە و پێیان وابووە زۆر گێلانە و نەفامانە کاریان لە بەرژەوەندی ئامانجەکانی ئەم کۆمەڵەی کردووە و هەموو داب و نەریت و ئاکار و تایبەتمەندییە نیشتمانیەکانیان پێشیل کردووە، ئەوەتا لە کتێبی (السر المصون) هاتووە: (الماسونية السورية في الوطن والمهجر اكبر ضربة علي الوطنية والاخلاق الطيبة والاداب الشريفة. ...). واتە: (ماسۆنییەتی سوری لە نیشتیمان و تاراوگەدا گەورەترین زەبرە لە نیشتیمان و ئاکاری جوان و ئادابی شکۆدار).

سەبارەت بە دامەزراندنی یەکەم مەحفەلی سوری هاتووە: لە ساڵی (١٨٦٢) یەکەم مەحفەلی سوری لە (بیروت) لە ژێر چاودێری (الشرق الاعظم الاسكتلندي) دامەزرا و بە (شرق فلسطين نمرة /٤١٥)

ناسرا و کۆمەڵێك کەس سەرپەرشتییان دەکرد و زمانەکەشی فەڕەنسی بووە. هەر هەمان سەرچاوە باس لەوە دەکات جگە لەم ژمارەیە، چەندین مەحفەلی دیکە لە شارەکانی (دمشق، حمص، حلب، عینتاب، ادنة، انطاکیة ) دامەزراون، لە ڕاستیدا بە بەردەوامی حاڵەتی کاری هاوبەش و پەیوەستبوون بەیەکەوە لە نێوان مەحفەلەکانی میسر و لوبنان و سوریادا هەبووە، زۆرجار تەواوکەری یەکتر بوونە، بەڵام دوای جەنگی جیهانی دووەم و بەڕێکی لە ساڵی (١٩٤٨) بە دواوە ماسۆنییەتی سوری و لوبنانی لەیەکتر جیابونەتەوە، تاکو ساڵی پەنجاکانی سەدەی بیستەمیش ماسۆنییەتی سوری لە کار و جموجۆڵ و گەشەکردندا بووە، وەلێ دوای ئەوەی وڵاتانی عەرەبی بە چاوی مەترسییەوە ڕوانییانە بەرنامە و سیاسەتەکانی ئەم کۆمەڵەیە، ئیدی بڕیاری یاساغکردنی درا و ئەگەر کاریشیان کردبێت ئەوا زۆر بە نهێنی و پەنهانییەوە بووە، یان لە ژێر ناو و کۆمەڵەی تردا کاری خۆیان کردووە.

## عێراق

ڕەنگە قسەکردن، یان بەخشینی زانیاری تەواو لەسەر مێژوو و بوون و جموجۆڵی ماسۆنیزم لە عێراق، کارێکی هێندە ئاسان نەبێت، ئەمەشیان لەبەر چەندین فاکتەری جۆراجۆرە بە تایبەتی نەبوونی سەرچاوە و زانیاری ورد و دروست لەسەر ئەم کۆمەڵەیە، هەروەها لەبەر ئەوەی عێراق بەبەراورد بە وڵاتانی تری دونیا و ناوچەکە

درەنگ بەم بابەتە ئاشنابوو، هەروەها کەمترین زانیاری لە بەردەستدان لەسەر ژمارەی مەحفەل و ژمارەی ئەندامەکانی، چونکە لە عێراق بە پێچەوانەی ولآتانی ترەوە کاری ماسۆنیزم پتر نهێنی و شاراوە بووە.

وەك لە هەندێك سەرچاوەکانەوە هاتووە، سەرهەڵدانی ماسۆنیزم لەم ولآتە دەگەڕێتەوە بۆ (الشیخ خزعل) کە میری (المحمرە) بووە و پەیوەندی پتەوەی هەبووە لەگەڵ ئینگلیزەکان و بۆ خۆشی ماسۆنییەکی چالاك بووە، هەر بۆیەش پلەی بەرز و بالآی وەرگرتووە لەم ڕێکخراوەدا بە هۆی خزمەت و کارە زۆر و زەوەندەکانیەوە بۆ ئەم ڕێکخراوە. بەلآم تا ئێرە باسی دامەزراندن مەحفەل و ژمارەی ئەندامەکان دیار نین.

زۆرێکیش لە ژێدەرەکان مێژووی دروستبوونی یەکەم مەحفەلی ماسۆنی لە عێراق دەگەڕێننەوە بۆ سالی (١٩١٨). لەم بارەوە هاتووە: دامەزراندنی یەکەم مەحفەلی ماسۆنی لە عێراق دەگەڕێتەوە بۆ دوای داگیرکردنی عێراق لە لایەن بەریتانیاوە، کە لە ژێر ناوی (محفل ما بین النهرین) لە شاری (البصرة) و بە ڕێکی لە سالی (١٩١٨) لەسەر دەستی کۆمەڵێك ئەفسەر و فەرمانبەری ئینگلیز دامەزراوە. هەرچەندە بۆچونێکی واش هەیە، پێش ئەم مەحفەلە لە (میناء العراق) مەحەفەلێکی تر هەبووە بەلآم شاراوە و نادیار بووە.

لە لایەکی ترەوە و لە ڕۆژنامەکانی عێراقدا هەواڵێك هاتووە کە مێژووی دامەزراندنی مەحفەلەکانی ماسۆنی لە عێراق دەگەڕێتەوە بۆ

ساڵی (١٨٣٩) و نزیکەی (٧٠٠) ئەندامی هەبووە، هەر هەمان ڕۆژنامە هەواڵێکی تری لە سەر ژمارەی مەحفەلەکان لە عێراق دا بلاوکردووەتەوە، گوایە لە ساڵی (١٩٦٤) ژمارەی مەحفەلەکان بریتیی بووە لە (١٨) مەحفەل و تەنها لە شاری بەسرەدا سێ بۆ چوار مەحفەلی تێدا بووە.

ئەگەر بێت و ئەم زانیارییانەی سەرەوە ڕاست و دروست بن، ئەوا مێژووی سەرهەڵدانی ماسۆنییەت هیچ پەیوەست نییە بە جەنگی جیهانی یەکەمەوە، بەڵکو پێشتریش بوونی هەبووە لە وڵاتەکەدا، بەلام بە شێوەیەکی نهێنی و پەنهانی، بەهەرحاڵ گومانێك لەسەر مێژووی پەیدابوونی ئەم کۆمەڵەیە لە عێراق لە ئارادایە و ئەوەی تاکو ئێستا نوسراوە لەسەر ئەم بابەتە نەیتوانیوە ئەم بابەتە یەکلایی بکاتەوە.

دەبێت ئەو ڕاستیەش بزانرێت دواتر بەهۆی بوونی داگیرکەری بەریتانیاوە لە عێراق، سەرجەم مەحفەلەکانی ئەم وڵاتە ڕاستەوخۆ پەیوەندییان بە (المحفل الاكبر الانكليزی)یەوە بووە، لە بارەی سەرۆکی مەحفەلەکانەوە، کاتێك ناوەکانیان دەخرێتە ڕوو دیقەت دەدرێت بەشی هەرە زۆریان ئینگلیزن و تەنها ژمارەیەك کەمیان عێراقی بوونە، ئەمەش ئەو ڕاستیەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە سەرباری بوونی ناکۆکی لەسەر مێژووی سەرهەڵدانی ماسۆنیزم لە عێراق، بەلام دوور و نزیك هەست بە بوونی کاریگەری و ڕۆڵی ئینگلیز

دەکرێت لە دروستکردن و بنیاتنانی پایەکانی ئەم کۆمەڵەیە لە عێراقدا.

سەبارەت بە جموجۆڵ و گەشەکردنی ماسۆنییەت لە عێراقدا هاتووە: ماسۆنییەت لەم وڵاتەدا هەر لە کۆتایی جەنگی جیهانی یەکەمەوە تاکو سەرهەڵدانی دەوڵەتی ئیسرائیل لە گەشەکردندا بووە، دوای ئەمە بۆ ماوەیەکی کورت لە کار کەوتووە، پاشان تاکو سەرهەڵدانی سیستەمی کۆماری لە ساڵی (١٩٥٨) سەرلەنوێ گەشاوەتەوە. دواتریش بۆ جارێکیتر لە کار کەوتووە.

لەمەڕ ژمارەی مەحفەلەکانیش سەرچاوەیەك بەم شێوەیە باسی لێوە دەکات و دەڵێت: هەرچۆنیك بێت لە عێراقدا (١٠) مەحفەل بوونیان هەبووە، کە دوای داگیرکاری ئینگلیز دروستبوونە بەم شێوەیە:

- مەحفەل (ما بین النهرین) لە ساڵی (١٩١٨) لە شاری (البصرة) دامەزراوە.
- مەحفەل (بابل) لە ساڵی (١٩٢٢) لە شاری (البصرة) دامەزراوە وژمارەکەی (٣٢٦) بووە.
- مەحفەل (صدق الوفا) لە شاری (البصرة) لە ژێر چاودێری (المحفل الوطني الاكبر المصري) دامەزراوە.
- مەحفەل (البصرة) لە شاری (البصرة) دامەزراوە، ژمارەکەی (٥١٠٥) بووە.

- مەحفەل (الفيجاء) لە شاری (البصرة) دامەزراوە، ژمارەکەی (١٣١١) بووە، ئەم مەحفەلە بۆ ئەو عێراقییانە دروستکراوە کە زمانی ئینگلیزیان زانیوە.
- مەحفەل (دار السلام) لە شاری (بغداد) دامەزراوە، ژمارەکەی (٥٢٧٧) بووە.
- مەحفەل (العراق) لە شاری (بغداد) دامەزراوە، ژمارەکەی (٤٤٧١) بووە.
- مەحفەل (کرکوك) لە شاری (کرکوك) دامەزراوە، ژمارەکەی (٧٠٧٩) بووە، کۆبونەوەکانی ئەم مەحفەلە لە بارەگای کۆمپانیای نەوتی عێراق (a.b.c) ئەنجام دەدران.
- مەحفەل (دجلة) لە شاری (بغداد) دامەزراوە، ژمارەکەی (٧٠٢٤) بارەگاکەی لە (الحبانية) بووە.
- مەحفەل (بغداد) لە شاری (بغداد) دامەزراوە، ژمارەکەی (٤٠٢٢) بووە و بارەگاکەی لە (بغداد)بووە.

هەموو ئەم مەحفەلانە ڕاستەوخۆ لە ژێر چاودێری (المحفل انکلترا الاعظم)دا بووە بە سەرپەرشتی (جمعية الاخوة) کە بارەگاکەی لە بەغداد بووە، چەندین جاریش ئەم کۆمەڵەیە ناوی خۆی گۆڕیوە و بە ناوی ترەوە درێژەی بە کارەکانی داوە، دوای ئەوەش ئاشکرا دەبێت لە ساڵی (١٩٧٥) ئەم کۆمەڵەیە دادەخرێت و سەرۆکەکەشی لە سێدارە دەدرێت.

هەر دەربارەی ژمارەی ئەندامانی ماسۆنی لە عێراقدا، کەوتۆتە بەر کەوانەی چەندین ڕای جیاوازەوە و هەندێکیان پێیان وایە ژمارەکەی دەگاتە (٦٢٥) ئەندام و بەم شێوەیە دابەش بووبوو بە سەر نەتەوە و شارو شارۆچکەکان لە عێراقدا.

یەکەم: لەو ژمارەیەی سەرەوە (٩٧) ئەندامی بێگانەی تێدابووە، کە (٨٥)ی ئینگلیز بوونە و (١٢)شیان هندی بوونە، هەموو ئەمانە فەرمانبەری داگیرکەری ئینگلیز بوونە و بەشێکیانیش لە ناو حکومەتی عێراقدا بەرپرس بوونە.

دووەم: هەرچی ژمارەی ئەندامە عێراقیەکانە، ئەوا بریتیی بووە لە (٥٢٨) ئەندام و بەم شێوەیە بەسەر ئایین و نەتەوەکانی نێو وڵاتدا دابەشبووبوون:

| نەتەوە/ئایین | ژمارەی ئەندام | ڕێژەی سەدی |
| --- | --- | --- |
| عەرەبی موسڵمان | ٢٨٥ | ٩، ٥٣٪ |
| جولەکە | ١٢١ | ٢٢٪ |
| مەسیحی | ٨٥ | ١٦٪(جگە لە ئەرمەنەکان) |
| ئەرمەن | ٢٢ | ٤.٪ |
| کورد | ١٢ | ٢، ٢٪ |
| تورکمان | ٣ | ٥،. ٪ |
| کۆی گشتی | ٥٢٨ | |

زۆربەی ئەمانە لە ڕووی چینایەتییەوە سەر بە چینی بۆرجوازی بوونە، ژمارەیەکیانیش بریتیی بوونە لە سەرۆك وەزیران و وەزیر و چەندین کەسایەتی دیار لە دەوڵەتدا، جگە لە ژمارەیەك ئەفسەر و ڕوناکبیر و خاوەن پیشە سەربەستەکان، زۆربەیان خەڵکی شارە گەورەکانی عێراق بوونە بەتایبەتی شارەکانی (بغداد، موصل، البصرة) و بەم شێوەیە دابەشبووبوون!

- سەرۆك وەزیرانی پێشوو، ٢کەس، (نوري سعيد) و (فاضل الجمالي).
- وەزیرەکانی پێشوو، ٣٤ کەس، (١٣وەزیر لەسەردەمی پاشایەتی، ١٦ وەزیر دوای شۆڕشی چواردەی تەمموزی ساڵی ١٩٥٨).
- پزیشك، ٤٠ کەس، (کە لەو ٤٠ کەسە، ٣ پزیشکی ددانی تێدا بووە ).
- ئەفسەرە پلەدارەکان، ٣٠ کەس.
- پارێزەر، ١٢ کەس.
- باڵیۆز و گەورە فەرمانبەرانی وەزارەتی دەرەوە، ١٨ کەس.
- هەڵگرانی بڕوانامەی دوکتۆرا، ١٥ کەس.
- پارێزگار و بەڕێوەبەری گشتی، ٢٢ کەس.
- ئەوانی تر، ٣٥٤ کەس، کە بریتیی بوونە لەفەرمانبەرانی حکومەت و کۆمپانیا بیانیەکان و بازرگان و هەروەها ئەندامانی نواب ).

کۆی گشتی دەکاتە: ٥٢٨ کەس.

بە هەرحاڵ کاتێك بەعسییەکان لە ساڵی (١٩٦٨) دەسەڵاتیان گرتە دەست، کەوتنە ڕاوەدوونانی ئەندامانی ئەم کۆمەڵەیە و هەندێك ڕێوشوێنی یاسایی و هەروەها توندوتیژیان گرتە بەر بەمەبەستی ڕێگرتن لە چالاکی و گەشەسەندنی ئەم کۆمەڵەیە و هەروەها بنەبڕکردنیان.

## کوردستان

لەبەر چەندین فاکتەر بوونی ماسۆنییەت و گەشەکردنی لە نێو کورداندا زۆر لاواز و کەم بووە، ئەمەش بەبۆچوونی بەندە بۆ ئەوە دەگەڕایەوە کوردستان لە ڕووی جوگرافیاوە دابەشکرابوو بۆ سەر چوار دەوڵەت، لە لایەکی تریشەوە کورد خاوەنی کیانێکی سیاسی دان پێدانراو نەبووە، هەموو ئەمانە کاری وای کردبوو ماسۆنیزمی جیهانی مامەڵەی ڕاستەوخۆ لە گەڵ کورداندا نەکات بۆ دامەزراندنی مەحفەل، بەڵکو تەنها لە ڕوانگەی دەوڵەتە سەردەستەکانەوە ئیش لەسەر ئەم ڕێڕەوە بکات.

دوای سۆراغ وگەڕانێکی زۆر لە هیچ لەو سەرچاوانەی لە بەردەستدان، هیچ زانیاریەکی ئەوتۆ وەچەنگ نەکەوتن لەسەر بوونی کۆمەڵەی ماسۆنییەت لە کوردستاندا، تەنها ئەوە نەبێت لە کتێبی (النشاط الصهيوني)دا هاتووە: ژمارەی ئەندامە کوردەکانی ماسۆنییەت لە عێراق دا تەنها (١٢) ئەندام بوونە، هەروەها لە کۆی

ئەو هەموو مەحفەلەی لە عێراق بوونە، تەنها مەحفەلی کەرکوك (لەسەر خاکی کوردستان بووە ) بە ژمارە (٧٠٧٩) و شوێنی کۆبوونەوەکانیشیان لە بارەگای کۆمپانیای نەوتی عێراق (a.b.c) بووە.

کەواتا لە کۆی (٦٢٥) ئەندامی ماسۆنی تەنها (١٢) ئەندامی کورد بوونە، هەروەها لە کۆی هەموو مەحفەلەکان تەنها (محفل کرکوك) لە سەر خاکی کوردستان بووە، دیارە دامەزراندنی ئەم مەحفەلەش بۆ ئەوە نەبووە پێویست بکات لە ناو کورددا ناوەندێك هەبێت بۆ کۆکردنەوەی ئەندام لە ناو کورداندا، بەڵکو زیاتر بۆ ئەو مەبەستە بووە کە (شركة النفط العراقية) گرنگی خۆی هەبووە چ لە ڕووی ئابورییەوە و چ لە ڕووی ئەوەوە ژمارەیەك لە فەرمانبەرەکانی گاور و جولەکە بوونە، بۆیە پێویستی بەوەکردووە مەحفەلێکی تێدا دروست بکرێت بۆ کۆکردنەوەی ئەو ئەندامانە.

# ناودارانی ماسۆنییەت لە جیهان دا

ماسۆنییەتیش وەك هەر ڕێکخراو و کۆمەڵەیەکی ئامانجدار و خاوەن ستراتیژی دوور مەودا، هەمیشە لەکاردا بووە بۆ دروستکردنی کاریگەری لەسەر تاکە ئەکتیڤ و دیاردەکانی نێو کۆمەڵ و هەوڵدان بۆ بە ئەندامکردنیان و هەروەها دروستکرنی کاریگەری لەسەر تەواوی کایە جیاجیاکانی کۆمەڵگەکانی مرۆڤایەتی، بەڵام بە شێوەیەکی پەنهانی و شاراوەیی.

بۆیە وەك دیقەت دەدرێت، ئەم کۆمەڵەیە خاوەن هەوڵ و تەقەللایەکی زۆرە، تاکو زۆرترین ئەندامی نموونەیی لە خۆی کۆبکاتەوە، کە بەشی هەرە زۆریان بریتین لە کەسانی سیاسەتمەدار و خاوەن بڕیار و سەرمایە و کەسانی ئەکادیمی و ڕۆشنفکر، ئەگەرچی بەم دواییانە ناوی ژمارەیەکیان ئاشکرابوونە، وەلێ پێدەچێت بە هەزاران ئەندامی تریش هەبن لەو چەشنە لە نێو مەحفەلەکانی ماسۆنییەتدا، ئەوەشی ئەم کۆمەڵەیە لەوانی تر جیا دەکاتەوە ئەوەیە ئەندام بەو چەشنەی دەخوازێت لە هەموو وڵاتانی دونیا کۆ دەکاتەوە وتەنها لە سنورێك یان دەوڵەتێك قەتیس نەبووە، بەڵام فەزای شاراوەیی ئەم کۆمەڵەیە وای کردووە ئاسان نەبێت ناوی هەموو ئەندامانی بزانێت ئەمەش یەکێکە لە خەسڵەتەکانی.

لێرەڕا بۆ زیاتر ئاشناکردنی خوێنەر بە کەسایەتی و هەندێك لە ئەندامە دیارەکانی ماسۆنیزم لە جیهاندا، وەکو نموونە ناوی چەندین ئەندام دەخەینە ڕوو، کە ڕەنگە تا ئەم چرکە ساتە جێگای تێڕامانی خوێنەر نەبووبێت.

# ئەندامە دیارەکانی ماسۆنییەت لە ڕۆژئاوادا

گومانی تێدا نییە زۆرترین ڕێژەی ماسۆنی لە ڕۆژئاوا دایە، بەتایبەتی لە هەردوو ولاتی ئەمریکا و بەریتانیا، ناکرێت ئێمە لیستێك ئامادە بکەین بۆ نموونە بە ناوی چوار ملیۆن ئەندام لە ئەمریکا و (٧٥٠) هەزار ئەندامیش لە ئینگلتەرا، کە تێیدا بە هەزاران کەسایەتی دیار بوونیان هەیە لە ئاستە جیاجیاکاندا، بێگومان ئەمەشیان کاری ئێمە نییە لەم توێژینەوەیەدا، بەڵکو ئێمە دێن و تەنها ناوی ژمارەیەك ئەندامی خاوەن پلەی ڕامیاری و ئایینی و کۆمەلآیەتی و فیکری و ئابوری. ..هتاد، پۆلێن دەکەین و بە کورتی ئاماژەیان پێدەکەین:

- براودو، ماسۆنییەکی بەرەچەڵەك جولەکەیە و کارەکتەرێکی گرنگی نێو بزوتنەوەی ماسۆنیزمە لە ڕوسیادا.
- فرۆید، یەکێکە لەو کۆڵەکانەی کە (هرتزل) پشتی پێی بەستووە، لە ساڵی (١٨٩٥) بووە بە ئەندامی کارگێڕی (بنای بریت) ناوبراو خاوەنی فەلسەفەیەکی تایبەت بووە و چەندین تیۆری لە بارەی خوا و مرۆڤ و ئاینەکانەوە پێشکەش کردووە، ئەو هەمیشە نەیاری ئایینەکان بووە و تێڕوانینێکی نەگەتیڤی هەبووە لە مەڕ بوونی ئایین و باوەڕەکان.

- هرتزل، دانەری بیرۆکەی زایۆنیزمە، جولەکەکان وەکو ڕێبەر و پەیامبەرێك تەماشای دەکەن خاوەنی کۆمەڵێك ئایدیا و بۆچوونی توندڕەو بووە لە هەمبەر ئایین و مرۆڤایەتی، ڕۆڵێکی گەورەی بینیوە لە پێشخستنی بزوتنەوەی ماسۆنیزمدا.
- غودفروا دی بوبون، بە ڕەچەڵەك جولەکەیەکی ڕەگەزپەرستە و خۆی خزاندبووە نێو مەسیحیەکانەوە، کەسێکی دیاری نێو کۆمەڵەی ماسۆنییەت بووە ، پێگەیەکی مێژوویی گەورەی هەبووە لەم بوارەدا.
- اللورد کیتشتر، ئەفسەرێکی ئینگلیزی بووە لە میسرڕ ڕاسپێردرا بوو بە تێکشکاندنی شۆڕشی مەهدی لە سودان، یەکێك بووە لە برایانی ماسۆنی و بە کەسێکی توندڕەو و شەڕانگێز ناسرابوو، بە تایبەتی لە خوێناویکردنی شۆڕشی سوداندا.
- مارتن لوثر، بەبنەچە جولەکە بووە، وەك دەگێڕنەوە خزابووە نێو ڕیزی مەسیحیەکانەوە، کاتێکیش دونیای مەسیحییەت پڕ دەبێت لە نادادپەروەری و شەڕوشۆڕ بە تایبەتی هاتنە پێشەوەی (صکوك الغفران/ پلیتی لێخۆشبوون)، ئا لەم کاتەدا ئەم وەك چاکسازیخوازێك دەردەکەوێت و دێتە مەیدان و دەبێتە داهێنەری ڕێباز وباوەڕی (البروتستانتی) و کۆمەڵێك گۆڕانی جەوهەری لە نێو ئایینی مەسیحییەت دێنێتە گۆڕێ.
- اولیفر کرومویل..

- دیزا کولییە، مەسیحیەکی پرۆتستانییە، بەرەچەڵەك خەڵکی ئینگلتەرایە، دوای ئەوەی (لاڤی) و کوڕەکەی و زاواکەی بە یەکتر ئاشنا دەبن و لەسەر بنەما کۆنەکانی هێزی شاراوە، ماسۆنیزم بە شێوە هاوچەرخەکەی زیندوو دەکەنەوە، کەواتا ناوبراو یەکێك بووە لە دامەزرێنەرە سەرەکییەکانی ماسۆنییەت، هەروەها بەوەش تاوانبارە گوایە (لاڤ) بە دەستی ئەم کوژراوە. دیزا کولییە لە ساڵی (١٦٨٣) لە دایکبووە و لە ساڵی (١٧٤٤) کۆچی دوایی کردووە، کەواتا (٦١) ساڵ ژیاوە، کەسێك بووە تا سەر ئێسك دژ بە ئایینی مەسیحی بووە، بە تایبەتی دژی بیرو باوەڕی کاسۆلیکی بووە.
- جون روبنصون، ماسۆنیەکی ئینگلیزی بووە، بەرپرس بووە لە (اکادمیة ادنبورغ) بە پیشە لە کۆمەڵەی ماسۆنییەتدا (کاتب اسرار) بووە، لە ساڵی (١٧٩٧) کتێبێکی نوسیووە و پاشتر لە ماسۆنییەت هەڵگەڕاوەتەوە.
- الکونت هوغفنس، ناوبراو وەزیری پادشا (بروسیە فردریك الکبیر) بووە، یەکێك بووە لە ماسۆنییە دیارەکان و دواتر هەڵگەڕاوەتەوە.
- برویل (barruel)، ماسۆنیەکی ناودار بووە و دواتر هەڵگەڕاوەتەوە.
- الدوق دی برونزویك، یەکێك بووە لە هەردوو سەرۆکە گەورەکەی ماسۆنییەت لە ئەڵمانیا.

## ئەندامە دیارەکانی ماسۆنییەت لە جیهانی عەرەبی و ئیسلامیدا

وەك سەرەتا ئاماژەمان بۆی کرد، دوای ئەوەی ماسۆنییەت لە ڕۆژئاوا بڵاوبووەوە، ئینجا نۆرە هاتە سەر وڵاتانی عەرەبی و ئیسلامی، سەرەتاش لە گەڵ شاڵاوەکانی ناپلیۆن بۆ سەر وڵاتی میسر دەستی پێکردوە. پاشان ئەمە بووەتە دیاردەیەك وڵاتانی تری عەرەبی گرتەوە، بەتایبەتی لەم وڵاتانەدا (میسر، سوریا و لوبنان، تورکیا، عێراق، ئێران، ئوردن. ..هتاد).

جا بۆ ئەوەی ئاشنا ببین بە ناوی ژمارەیەك لە کەسە دیارەکانی ماسۆنی لە وڵاتانی عەرەبی و ئیسلامیدا، تەنها ناوی کۆمەڵێکیان وەك نموونە دەخەینە بەر دەست، کە ئەندامی کارا بوونە لە نێو ئەم کۆمەڵەیەدا، تەنانەت هەندێکیشیان گەیشتبوونە پلەی باڵا:

- توفیق پاشا، کوڕی (اسماعیل پاشا)یە و توانی ببێتە خاوەن پلەی (استاذ الاعظم) و هەروەها بووە سەرۆکی فەخری مەحفەلی گەورەی میسر، کاتێکی زۆری بۆ خزمەت کردنی ماسۆنیزم تەرخانکردبوو لە پانتایی وڵاتی میسردا.

- حسن فوزی پاشا، وەزیری دادی میسرِ بووە، لە سەر داوای (توفیق پاشا) دەکرێتە سەرۆکی هەمان مەحفەل.
- الامیر عزیز حسن، دامەزرێنەری مەحفەلێکی مەزنە بەناوی (المحفل الاکبر الاورشلیمي).
- ادریس راغب، ماوەیەك سەرۆکی (المحفل الاکبر الوطني المصري) بووە.
- الامیر محمد علی، ماسۆنیەکی دیاری میسرِ بووە.
- حاییم ناحوم، جولەکەیەکی ماسۆنی بووە لە میسرِ و کاریگەری زۆری هەبووە لە گەشەکردنی ئەم کۆمەڵەیە لەو وڵاتەدا، تەنها بۆ خۆی توانیویەتی (٣٢٠) مەحفەل دروست بکات.
- یوسف الحاج، مامۆستایەکی مەزنی هەرێمایەتی بووە و هەڵگری پلەی (٣٣) بووە لە نێو کۆمەڵەی ماسۆنییەتدا، کە بەرزترین پلەیە، دامەزرێنەری چەندین مەحفەل بووە.
- جمال الدین الافغانی، تا ئێستاش ئەندامبوونی ئەم ناوە گەورەیەی جیهانی ئیسلامی جێگای گومانە، بەلاّم ئەوەی زانراوە لە ساڵی (١٨٧٥) یاداشتێکی داوە بە مەحفەلی ماسۆنی لە قاهیرە بەمەبەستی ئەوەی وەکو ئەندام وەربگیرێت، تاکو ئێستاش ئەو یاداشتە لە کتێبخانەی پەرلەمانی ئێران پارێزراوە، کە بە دەستوخەتی خۆی نوسراوە.

هەروەها ئەمەی لای خوارەوەش ناوی چەندین ئەندامی تری کۆمەڵەی ماسۆنییە لە وڵآتانی عەرەبی و ئیسلامیدا:

- محمود سامي البارودي
- عبدالسلام المويليحي
- ابراهيم المويليحي
- ابراهيم اللقاني
- علي المظهر
- الشاعر الزرقاني
- ابو الوفاء التوني
- سليم النقاش
- جرجی الخوری (لبناني)
- سلين الريس (لبناني)
- نقولا حجي (لبناني)
- يوسف عربيلي (لبناني)
- اسير شقير (لبناني)
- جرجي سرسق (لبناني)
- د.اسكندر نقولا البارودي (لبناني)
- فارس بشارة (لبناني)
- اديب الفرزلي (لبناني)
- صبري حمادة (رئيس مجلس النواب لبناني/سابقا).
- حسين العويني

- القاضي مصطفى الرافعي
- لميس اديب
- عبدالقادر الجزائري (سوري/ جزائري)
- فؤاد غصن (سوري)
- محمد درويش (سوري)
- احمد ناجي (سوري)
- محمد سعيد الجزائري (سوري)
- د. قرقوط (سوري)
- عبدالرحمن الامام (سوري)
- حليم الدموس (سوري)
- اديب اسحاق
- عبدالله النديم
- د. احمد غلوش
- محمد عبداللة عنان
- جرجي زيدان
- شاهين مكاريوس
- موسى تمور
- الشيخ ابراهيم منذر
- سعدالدين خالد
- د.فؤاد غصن
- جورج رزق اللة

- امين الريحاني
- ولي الدين يكن
- يوسف وهبي
- محسن سرحان
- حسين الرياض
- محمود المليجي
- حلمي رفلة
- فؤاد شفيق
- يعقوب الاطرش
- سعداللة الجابري
- فؤاد حمدي
- المحامي فؤاد سنطو
- د. احمد حمدي النعماني
- هاشم توكل
- ناجي الخباز
- يعقوب نزهة
- وهب تماري
- الحاج توفيق حماد
- عمر البيطار
- فؤاد حسين بك
- احمد صديق بك

- عبدالمجيد مرتضى (الاردن)
- د.سليما البستاني (الاردن)
- الشيخ غزعل (العراقي)
- نوري السعيد (العراقي)
- فاضل الجمالي (العراقي)

# قەلاچۆکردنی ماسۆنییەت

پاش ئەوەی جولانەوەی ماسۆنیزم پەلی گەشەکردن و بلاوبونەوەی بۆ زۆربەی ولاتانی جیهان هاویشت، هەروەها توانیشی لە ڕێگای مەحفەل و یانە تایبەتەکانەوە گەرا لە نێو پایەکانی دەسەلات و ناوەندەکانی بڕیار بەدەست دابنێت و کاریگەری بخاتە سەر ڕەوتی بڕیار و ڕووداوە جیهانییەکان، بەتایبەتیش کاتێك لە نێو ئەدەبیات و پەیام و بەرنامە و گوتاری فەزای ماسۆنییەتدا ئەو ڕاستییە ئاشکرا بوو، کە کار بۆ ڕەتکردنەوەی ئایین و هەروەها سڕینەوەی هەموو ڕێباز و باوەڕەکان دەکات، ئیدی بەرەکانی دژە ماسۆنییەت لە جیهاندا پتر فراوان بوون، بۆیە پیاوانی ئایینی بەتایبەتی هی هەردوو ئایینی مەسیحی و ئیسلام. .پیاوانی نێو سیاسەت و پارت و ڕێکخراوە ڕامیارییەکان و ئایدیا فیکری و فەلسەفییەکان... و بەشێکی زۆر لەمانە پێکەوەڕا کەوتنە بەرەی دژە ماسۆنییەتەوە.

بۆیە ناوەندە ئایینی و حکومیەکان لە چەندین ولاتی جیاجیادا، لە ڕێگای چەندین بڕیار و یاداشتی جۆراوجۆرەوە، کەوتنە دژایەتیکردنی ماسۆنییەت، لەم بارەوە گەلەك بڕیاری توند دەرچوون بە مەبەستی یاساغکردن و قەلاچۆکردنی بوون و هەموو جۆرە کار و

چالاکییەکی ئەم کۆمەڵەیە، زۆرێك لە ناوەندەکانی دەسەلأت بوونی ئەم کۆمەڵەیەیان بە ئافات و مەترسی گەورە لە قەڵەم داوە، هەر بۆیە زوو داوای ئەوەیان کردووە دەست بەجێ مەحفەل و یانەکانی دابخرێن و قەدەغە بکرێن، خۆ وەك دەبینرێت ژمارەیەك ولأتی تریش هەن بۆ خۆیان هاوکار بوونە بۆ ئەم کۆمەڵەیە و بە شانازییەوە و زەمینەی بلأوبوونەوەیان بۆ ڕەخساندووە و تەنانەت ئاڵوگۆڕی بەرژەوەندیش لە نێوانیاندا هەبووە، بۆ پاراستن و خزمەتکردنی بەرژەوەندییە هاوبەشەکانیان.

ئێستاش بۆ ئەوەی ئاست و قەبارەی ئەو نارەزایی و دژایەتیکردنەی ماسۆنییەت بزانین لە هەندێك ولأت و ناوەندە ئایینیەکان، لەم بارەوە کۆمەڵێك نموونەی جۆراوجۆر دەخەینە ڕوو.

- لە (٢٧نیسانی ساڵی ١٧٣٨) پیاوێکی دیاری وەك (ئەقلیمیسی دوازدەهەم) وەك کەسێکی لە ڕۆما بەرپرسیاریبوونی خۆی لە بەرانبەر ئەم کۆمەڵەیەدا دەردەبڕێت و لە پەیامێکدا بە ئاشکرا داوا دەکات گشت لایەك دژ بە هەموو ئەو ڕێکخراوە نهێنییانە بووەستنەوە، بەتایبەتی (ماسۆنییەت) کە دژایەتی ئایین و داب و نەریت دەکات و بۆ خۆی بووە بە سەرچاوەی مەترسی بۆ سەر ژیانی مرۆڤایەتی، دوای ئەم بەڕانەت نامەیە تۆزێك جموجۆڵی ماسۆنیزم خاو بووەوەو تەنانەت دوچاری هەندێك لاوازی بوو.

● پاش ئەوەی دەسەلات دەکەوێتە دەستی (بندکتوسی چواردەهەم) کۆمەڵەی ماسۆنییەکان بانگەشە بۆ ئەوە دەکەن، ئیتر لەم سەردەمەدا کار بەبەڕاننامەکەی پێشوو ناکرێت و دەبێت ئیش بۆ بوژاندنەوە و بە هێزکردنەوەی کۆمەڵەکەیان بکەنەوە، وەلێ بە پێچەوانەی ئەم دیدەوە (بندکتوسی چواردەهەم) لە (١٨ئاپاری ساڵی ١٧٥١) وەك بەرپەرچدانەوەیەك بۆ ئەو بانگەشەیە، بەناوی خۆیەوە بەڕاننامەیەکی نوێ دەنوسێت و تێیدا پشتگیری لەوەی پێشوو دەکات و پاشان چەندین هۆکار دەخاتە بەر دیدەی لایەنگرانی ماسۆنیزم بۆ مەترسی و گومان لە نیازە خراپەکانی ئەم کۆمەڵەیە، بۆیە بە هێنانەوەی گەلەك بەڵگە و ئاماژەی ترسناك، هەر زوو بە چاکی زانیوە کار و جموجۆڵی ئەم کۆمەڵەیە قەدەغە و یاساغ بکرێت و ڕێگایان بۆ ئاچوغ نەکرێت پەیامەکانیان جێ بەجێ بکەن.

● (بیۆسی حەوتەم) دوای ئەوەی دەگەڕێتەوە بۆ کەنیسە لە (ڕومیە)ی پایتەخت، یەکسەر بە توندی دەکەوێتە وێزەی کۆمەڵە نهێنییەکان و بە پێی مەرج و یاساکانی کەنیسە سزایان دەدات، بێگومان یەکێك لەو کۆمەڵانە خودی ماسۆنییەکان بووە.

● (لاونی دوازدەهەم) خاوەنی بەڕانەتێکی گەورەیە، لە (١٢ ئازاری ساڵی ١٨٢٦) لەم بارەوە (الاب لویس شیخو) پێی وابووە

دەبوایە ئەم بەڕائەتنامەیە بە ئاڵتون بنوسرایە, چونکە ئەوەندە گرنگ بووە، لەم بەڕائەتنامەیەدا باس لە هەموو خاسیەت و شێواز و بەرنامەی کاری ماسۆنیزم دەکات، بە پێی ناوەڕۆکی ئەو بەڕائەتنامەیە، چەند مەترسی بووە بۆ سەر گەلان، لەوە زێتر بەلآیەکی گەورەشن بۆ سەر جیهان، هەروەها هەموو جۆرە ڕێکخراوێکی نهێنی بە مەترسی لە قەڵەم داوە و جەختی لە سەر ئەوە کردۆتەوە کە دەبێت قەدەغە بکرێن.

- لە سەردەمی (گریگۆریۆسی شازدەهەم) دەوڵەتی (پاپەوی) کۆمەڵێك نهێنی ئەم ڕێکخراوانەی وەچەنگ کەوت، کە بۆ هەمووان ئاشکرا کران، بەرنامە و کاری ئەم جۆرە ڕێکخراوانە چەندە مەترسین و سەرچاوەی زۆرێك لە گرفت و ڕووداوە جیهانیەکانن، بۆیە لە (١٥ی ئابی ساڵی ١٨٣٢)دا و لە نامەیەکدا بۆ جیهانی کاسۆلیکی کە بە وشەی (m irari v()!!) دەست پێدەکات و تێیدا باس لە کار و کردەوەکانی ماسۆنییەت دەکات و بانگەشەی ئەوە دەکات، کە دەبێت لە جیهاندا ئابڕویان ببرێت و ئاشکرا بکرێن بۆ جیهان کە چەند مەترسین بۆ سەر مرۆڤایەتی.
- دواتریش لە سەردەمی هەر یەك لە (بیۆسی حەوتەم) و (لاونی سێزدەهەم) بە هەمان شێوە فەرمانی قەدەغەکردنی ئەم کۆمەڵەیە دەدەرێت.

- هەروەها چەندین گەورە پیاوی ئایینی لە دونیای مەسیحیدا لە سەدەی نۆزدەدا، بە تایبەتی لەولآتانی لاتینی و ڕۆژهەلآت بە هەموو شێوەیەك بەگژ بوون و كارو چالاكی ئەم كۆمەڵەیەدا چوونەوە و بە كارەساتیان زانیوە بۆ گەلان و ئایین و تەنانەت مرۆڤایەتیش.

بۆ نموونە هەر یەك لەم كەسە دیارانە بە توندی دژی كۆمەڵەی ماسۆنییەت وەستاونەتەوە:

- السيد يوسف ظالركا
- البطريرك جرجس شلحت
- البطريرك الياس الحويك
- نيافة القاصد الرسولي
- المطران يوسف الديس
- السيد جرمانوس معقد
- السيد يوحنا مراد
- السيد منصور براكو
- السيد البطريرك بولس مسعد
- السيد غودنسيو بنفيلي
- السيد ملاتيوس فكاك
- السيد المطران انطوان عريضة
- السيد كيرس مغيب

گەر دیقەت بدەین، لە نێو ئەو کەسایەتییە ئایینییانەی کە پاش ماوەیەك کارکردن لە نێو کۆمەڵەی ماسۆنییەت، دواتر جیابوونەتەوە و لێی چوونەتە بەرەی دژەوە، چەندین گەورە پیاوی موسڵمان وەك (جمال الدين الافغاني) و (محمد عبده)مان بەرچاو دەکەوێت.

وەك لە سەرچاوەکاندا هاتووە، چەندین دەوڵەت لە ئاستی جیهاندا و هەروەها لە چەندین ناوەندی باڵای ئایینیدا، بەتایبەتی هەردوو ئایینی مەسیحیی و ئیسلام، زۆر بە ئاشکرا بەرەنگاربوونەوەی خۆیان لە دژی ماسۆنییەت دەربڕیوە وبەجدی کاریان بۆ بنەبڕکردن و یاساغکردنی کردووە، بۆیە لای خوارەوە ناوی کۆمەڵێك وڵات و ناوەندی ئایینییان پۆلێن کردووە وەك نموونە:

١- ئیسپانیا، لە ساڵی (١٧٤٠) پادشای ئیسپانیا (فیلیپۆسی پێنجەم) فەرمانێکی دەرکرد بۆ لەدەرکردنی ماسۆنییەت لە وڵاتدا، هەروەها لە (٢ تەمموزی ساڵی ١٧٥١) هەمان فەرمان لەلایەن (فردیناندی شەشەم)وە نوێکرایەوە و بڕیاردرا ئەوانەی سەرپێچی دەکەن وەك دوژمنی گەل سزا بدرێن، لە ساڵی (١٨١٤) پادشا (فردیناندی حەوتەم) بڕیاری داخستنی سەرجەم مەحفەلەکانی ماسۆنییەتیدا.

٢- ئەسوج، پادشای یەکەم (فردریك) لە ساڵی (١٧٣٨) فەرمانیدا بە هەڵوەشاندنەوەی هەموو مەحفەلەکانی ماسۆنییەت.

٣- **ئەڵمانیا**، ئیمپراتۆر (کارلۆسی شەشەم) لە ساڵی (١٧٣٧) فەرمانیدا هەموو جۆرە کۆبوونەوەیەکی ماسۆنی قەدەغە بکرێت و لە هەمان ساڵدا هەموو ئەندامانی (محفل مانهیم) دەست بە سەرکران و پاشان لە ساڵی (١٧٣٨) ڕاگوێزران بۆ وڵاتی نەمسا و بەلجیکا، پاشان چەندین لێپێچینەوە لەلایەن حکومەتەوە بە دوایدا هات دەرهەق بە مەحفەل و کۆمەڵەی ماسۆنی و زۆریشیان بە توندی سزا دران.

٤- **ئینگلتەرا**، لە (١٣ی تەمموزی ساڵی ١٧٩٨) ئەنجومەنی دەوڵەت ڕەزامەندی لەسەر ئەوە نیشاندا هەموو کۆمەڵە نهێنییەکان ڕاپێچ بکرێت، تەنها کۆمەڵەی ماسۆنییەت نەبێت، بەڵام بە مەرجێك مەحفەلی نوێ نەکرێتەوە و مەحفەلە کۆنەکانیش پابەندبن بە مەرجەکانی چاودێریکردنی لەلایەن دەوڵەتەوە.

٥- **ئیتالیا**، لە نیوەی یەکەمی سەدەی هەژدەدا (دوق طوسكانة الكبير جان غستون) فەرمانی دژایەتیکردنی ماسۆنییەتی دەرکرد و بانگەشەی بۆ ئەوە کرد ئەندامەکانیان ڕابگوێزرێن.

٦- **پورتوغال**، لە ساڵی (١٧٤٢) پادشا (جانی پێنجەم) فەرمانیدا بە پشکنینی هەموو کۆمەڵەکانی ماسۆنییەت و هەروەها قەدەغەکردنی.

٧- **پروسیه**، (فردریك غلیومی سێیەم) فەرمانی بەرتەسك کردنەوەی کاری ماسۆنییەتی لە وڵاتدا و هەروەها فەرمانیدا هەموویان بخرێنە ژێر چاودێرییەوە، هەر کەسێکیش مەحفەلی نوێ بکاتەوە، ئەوا دەبێت (٢٠) ساڵ زیندانی بکرێت.

٨- **پۆڵۆنیا**، پاشا (ئۆگستی دووەم) لە ساڵی (١٧٣٩) فەرمانی داخستنی هەموو مەحفەلەکانی ماسۆنییەت لە وڵاتدا و قەدەغەی کردن.

٩- **تورکیا**، دوای ئەوەی دەوڵەتی عوسمانی هەست بە جموجۆڵ و گەشەی بزوتنەوەی ماسۆنییەت دەکات لە چوارچێوەی جوگرافیای دەوڵەتەکەیدا، بۆیە دەکەوێتە خۆ و لە ساڵی (١٧٤٨) بابی عالی فەرمانی داخستنی مەحفەلەکانی ماسۆنی دەدات و ئەندامەکانی ڕاپێچ دەکات.

١٠- **ڕوسیا**، پادشای ڕوسیا (کاترینای دووەم) سەرەتا لەگەڵ ماسۆنیەکاندا باش دەبێت، بەڵام دوای ئەوەی هەست بە مەترسی و جموجۆڵی مەبەستداری ئەم کۆمەڵەیە دەکات، یەکسەر فەرمان دەدا پرۆسەی پشکنین و چاودێریکردنی مەحفەلەکانی ماسۆنی، کاتێکیش کوڕەکەی (پۆڵسی یەکەم) دەسەڵاتی گرتە دەست، دەست بەجێ دژی ڕێکخراوە نهێنییەکان وەستایەوە، بەتایبەتی ماسۆنییەت و پاشان فەرمانی دا دووربخرێنەوە بۆ وڵاتێکی تر.

١١- سویسرا، لەساڵی (١٧٤٣) ئەنجومەنی برن (مجلس برن) کۆدەبێتەوە و سەرئەنجام بڕیاری داخستنی تەواوی مەحفەلەکانی ماسۆنی لە وڵات دەدات، لەگەڵ ئەمەشدا چەندین یاسای توند دەرکران بە مەبەستی سزادانی ئەندام و لایەنگرانی ئەم کۆمەڵەیە.

١٢- فەرەنسا، ئەم وڵاتە بەیەکەم وڵات دێتە ئەژماردن لە مەڕ وەستانەوە و دژایەتیکردنی ماسۆنیزم، بۆ نموونە دادگای پاریس لە ساڵی (١٧٣٧) هەر زوو فەرمانی قەدەغەکردنی هەموو ڕێکخراوە نهێنییەکانی دەرکرد، بەتایبەتی کۆمەڵەی ماسۆنی، هەمان هەڵویستی توند لە لایەن پادشاکانی تری ئەو وڵاتەوە دەرهەق بەم کۆمەڵەیە پەیڕەوکران و زۆریش بە توندی بەگژ بەرنامە و ئامانجەکانی ماسۆنییەتدا چوونەوە.

١٣- مۆناکۆ، لە ساڵی (١٧٨٤) میری مۆناکۆ فەرمانی هەڵوەشاندنەوەی هەموو ڕێکخراوەکانی ماسۆنییەتیدا.

١٤- نەمسا، لەم وڵاتە هەمان فەرمان و حوکمەکانی وڵاتی ئەڵمان بەسەر مەحفەل و ئەندامانی کۆمەڵەی ماسۆنییەتدا سەپێنران.

١٥- هۆڵەندا، یەکێکە لەو وڵاتانەی هەر زوو کەوتە وێزەی ماسۆنییەت و بە پێی فەرمانی شورای وڵاتەکەیان لە ساڵی (١٧٣٥) بە توندی بە گژی ئەم کۆمەڵەیەدا چوونەوە و بڕیاری داخستنی مەحفەلەکانیاندا.

- **هیتلەر**، سەرکردەی ئەڵمانی (ئەدۆڵف هیتلەر) یەکێك بووە لەوانەی زۆر دژی ماسۆنییەت و تەنانەت هەڵویستی ئێجگار توند بووە، بەڵگەش ئەوەیە فەرمانی دابووە یاریدەدەرەکەی (جەنەراڵ ئەنجمان) بە ملیۆنان جولەکە بسوتێنێ، کاتێکیش هیتلەر لە ڕێگای زانیاری دەزگا هەواڵگرییەکەیەوە (الغستابو) دەگاتە ئەنجام کە ئەم ڕێکخراوە بە جۆر و پێکهاتە و ئامانجەکانییەوە مەترسیدارن، یەکسەر سیاسەتێکی توند لە هەمبەریاندا پەیڕەو دەکات و هەموو مەحفەل و یانە و ڕێکخراوە نهێنی و تایبەتیەکانیان هەڵدەوەشێنێتەوە لە وڵاتدا.
- **کۆمۆنیزم**، دوای سەرکەوتنی شۆڕشی ئۆکتۆبەری ساڵی (١٩١٧) و گرتنە دەستی دەسەڵات لە لایەن شیوعیەکانەوە، ناکۆکی دەکەوێتە نێو شیوعییەکانی ئەورووپای ڕۆژئاواوە، چەندین جیابوونەوە و حاڵەتی دەست لە کارکێشانەوە و ناکۆکی و ململانێ لە نێوانیاندا دروست دەبێت، دواتر و لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەی بەردەوام کە لە کۆنگرەی چوارەوە لە ساڵی (١٩٢٢) سەرچاوەی گرتبوو، گەیشتنە ئەو ئەنجامەی کەم تا زۆر ماسۆنییەکانی ئەو وڵاتە ڕۆڵێکی خراپیان بینیبوو لەو گەورەکردنەو زیاتر ئاڵۆزکردنی ناکۆکییەکان، لە هەمبەردا وەك دژە کردارێك لەو مێژووە بە دواوە لە بەرنامە و پێڕەوی پارتی کۆمۆنیستی سۆڤێت و زۆربەی پارتە کۆمۆنیستەکانی

تردا، ماسۆنییەت یاساغ و قەدەغەکرا و بە دوژمنی سەرسەختی سۆشیالیزم هاتە ئەژماردن.

- **بەعسییەکان**، کاتێك لە (١٧تەممووزی ساڵی ١٩٦٨) هاتنە سەر حکوم، یەکسەر کەوتنە ڕاوەدونانی ماسۆنییەکان و هەندێك ڕێوشوێنی توندیان گرتەبەر، بەمەبەستی نەهێشتنی چالاکییەکانی ئەم کۆمەڵەیە، هەر لەم بارەوە لە ساڵی (١٩٧٥) سەرکردایەتی بەناو شۆڕش بەپێی بڕیاری ژمارە(٢٠١) کە تێیدا هاتبوو (یعاقب بالاعدام کل من جند او روج مبادی صهیونیة بما في ذلك الماسونیة، او انتسب الى أي من مؤسساتها، او ساعدها مالیا، او ادبیا ،اوعمل بأي کیفیة لتحقیق اغراضها). کەواتا بە پێی ئەم بڕیارە هەموو جۆرە پەیوەستبوون و هاوکاری و هاوسۆزییەك لەگەڵ زایۆنیزمدا، هەروەها کۆمەڵەی ماسۆنیزمدا ئاکامەکەی لە سێدارەدان بووە، جیا لەمەش چەندین یاسا و ڕێوشوێنی دیکە لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە دەرکران بە ئامانجی بنەبڕکردن و یاساغکردنی ئەم کۆمەڵەیە.
- **المجمع الفقهي**، ئەم کۆمەڵەیە بارەگاکەی لە شاری (مکة المکرمة) بووە لە شانشینی عەرەبی سعودیی، لە کۆبونەوەیەکدا لە (١٩٧٨/٧/١٥) بە سەرۆکایەتی سەماحەتی (شیخ عبدالله بن حمید) بڕیارێکی شەرعی دەردەکەن و تێیدا بە توندی کۆمەڵەی ماسۆنییەت و هەر جۆرە پەیوەندییەك پێیەوە قەدەغە دەکەن و ئەم کۆمەڵەیە بە دەسیسەی زایۆنیزم

دەزانن، هەروەها لەو بڕیارەدا جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە، ئەم کۆمەڵەیە مەترسییە بۆ سەر مرۆڤایەتی و ئایین و گەلان، بۆیە هەر کەس پەیوەندی پێوە بکات بە پێی شەرعی ئیسلامی (کافر) دەبێت و لە ئایینی ئیسلام دەردەچێت بەو مەرجەی ئەگەر بێت و بە ناوەڕۆك و ڕاستی ئامانج و بەرنامەکانی ماسۆنییەت بزانێت و کەچی پەیوەندیشیان لە گەڵ ببەستێت.

- **کۆمکاری عەرەبی (جامعة الدول العربیة)**، لە کۆبونەوەیەکیاندا لە (١٩٧٧/٦/١) بڕیاری ئەوەیان دەرکرد، بە هەموو شێوەیەك **هاوکاری** و پەیوەندیکردن بەم ڕێکخراوەوە قەدەغەیە و دەبێت **هەموو لایەك پاساغی** بکەن، ئەمەی لای خوارەوەش ناوەڕۆکی بڕیارەکەیە!

بسم الله الرحمن الرحيم

جامعة الدول العربية

مكتب مقاطعة اسرائيل

الاسكندرية

الموضوع / قرار مقاطعة الماسونية

١-اعتبار الحركة الماسونية حركة صهيونية لانها تعمل بايجاد منها لتدعيم اباطيل الصهيونية واهدافها، كما انها تساعد على تدفق الاموال على اسرائيل من اعضائها الامر الذي يدعم اقتصادها ومجهودها الحربي ضد الدول العربية.

٢-حضر اقامة او محافل لنشاط الحركة الماسونية في الدول العربية واغلاق أي اماكن لها تكون قائمة الان في تلك الدول.

٣-لايجوز التعامل ايا كان نوعه وطبيعته مع مراكز هذه الجماعة او محافلها في مختلف انحاء العالم.

صدر في: ١٩٧٧/٦/١

المفوضى العام

● ئێران، خۆپیشاندانی خوێندکارانی زانکۆ بە ڕێبەرایەتی ئیمام (خومەینی) دژ بە ئەمریکا و هەروەها زایۆنیزم، لە کردەیەکدا (الحرس الثوري) پەلاماری مەحفەلەکانی ماسۆنیزمیدا و توانی زیاتر لە (٤٠) مەحفەل دابخات، زۆرێك لە بەرپرسە بالأکانی ئێران لە ئاستی سەرۆك وەزیران و وەزیر و لە ئاستی پلە بەرزەکانی تری دەوڵەتدا ئەندامی کارای کۆمەڵەی ماسۆنییەت بوونە، بۆیە بە فەرمانی حکومەتی ئیسلامی هەموویان سزا دران و بەشێکیشیان هەڵهاتن.

ئەم نموونانەی سەرەوە بەشێکی هێجگار کەمن لە هەڵوێست و مامەڵەکردنی توندی ڕێبەرانی ئایینی و سیاسی وڵاتانی دونیا لە مەڕ قەدەغەکردنی جموجۆڵ و بوونی کۆمەڵەی ماسۆنییەت لە وڵاتەکانیاندا، بەڵکو چەندین نموونەی تریش شك دەبرێن کە بێ ڕتوش باس لە هەڵوێستی دەوڵەت و ناوەندە جیاجیاکانی بڕیار بەدەست دەکات لە دونیادا لە هەمبەر یاساغکردنی هەر جۆرە بوونێکی ئەم کۆمەڵەیە.

# سەرچاوەکان

١- اسرار الماسونية، جنرال جواد رفعت اتلخان، ترجمة: الواعظ والقابلي.

٢- تأريخ الجماعات السرية، اركون دارول.

٣- التأريخ السياسي لامارة عربستان العربية، د. مصطفى عبدالقادر النجار.

٤- تاريخ الماسونية، جرجي زيدان.

٥- جريدة العرب العراقية، الصادرة في (١٩ اب سنة ١٩٦٤).

٦- الجمعية الماسونية حقائقها وخفاياها، د. احمد غلوش.

٧- الحشاشون، برنارد لويس، ترجمة: سهيل زكار.

٨- خطر اليهودية العالمية على الاسلام والمسيحية، عبدالله التل.

٩- السر المصون في شيعة الفرمسون، الاب لويس شيخو، الطبعة الثانية ١٩٨٤، الناشر: منشورات نويل / دمشق.

١٠- السر المصون، كراس الاول، الاب لويس شيخو.

١١- ظهر الاسلام، ج٤، احمد الامين، الطبعة الثانية، دار العلمية / بيروت-لبنان.

١٢- العالم الاسلامي والمكائد الدولية خلال القرن الرابع عشرالهجري، فتحي يكن، الطبعة الثالثة عشر ١٩٩٧، مؤسسة الرسالة.

١٣- عملاء تحت المجهر، فاضل الشهابي، مطبعة دار الجاحظ / بغداد.

١٤- عن تأريخ الجماعات السرية، اركون دارول.

١٥- الماسونية بلا قناع، ابو صادق.

١٦- الماسونية في الوطن العربي، نجدة فتحي صفوة.

١٧- الماسونية والبهائية، موفق مصطفى العمري.

١٨- الماسونية والمنظمات السرية ماذا فعلت ؟ ومن خدمت ؟ عبدالمجيد همو، الطبعة الثالثة ٢٠٠٥، الناشر:الاوائل للنشر والتوزيع / سوريا.

١٩- الماسونية، سعيد الجزائري، الطبعة الاولى ١٩٩٠، دار الجيل / بيروت.

٢٠- النشاط الصهيوني الماسوني في الوطن العربي، ج١، محمد موسى النبهاني، الناشر: الدار القومية لكتاب العرب.

٢١- هؤلاء اليهود، محمد المهدي الحسين، منشورات التبليغ / كربلاء.

٢٢- الوسيط في الذاهب والمصطلحات الاسلامية، د. محمد عمارة، الطبعة الرابعة ٢٠٠٦، الناشر: نهضة المصر.

